خۆشم ویست، ڕۆمانێکە، ئازار دەگۆڕێت بۆ شتێکی تر، مەرج نییە ئەو شتەی تر خۆشبەختی بێت، بەڵام مانایەکی نوێیە بۆ ئازار و خۆشبەختییەکان. دواجار، ئەوە گرنگە ئازارکێشانی مرۆڤ مانایەکی هەبێت. دەتگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی ئەگەر مرۆڤ ویستی گۆڕانکاری لە ژیانیدا بکات، دەبێت بیکات، تەنانەت ئەگەر بەوە ئازاری بەرامبەرەکەیشی بدات، لەوە باشترە بترسێت و نەیکات و بەو هۆیەشەوە بۆ خۆی بەدبەخت بێت و سەرەنجام ئەوانەی دەوروبەریشی بەدبەخت بکات. ئەگەر ئەوەی تۆ خۆشت دەوێت، کەسێکی تری خۆش ویست، با بڕوات، تۆ یەکجار ئازاری خۆت بکێشیت لەوە باشترە ئەو بمێنێتەوە و تۆش هەموو ڕۆژێکی ژیانت لەگەڵیدا سووکە ئەشکەنجەیەک بێت.




# خۆشم ویست

## ئانا گاڤاڵدا

**ژوان جەلال** لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی





له زنجیره بڵاوکراوەکانی

ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

زنجیرەی کتێب ٩٠


# خۆشم ویست

ڕۆمان

## ئانا گاڤاڵدا

**ژوان جەلال**

**لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی**


- بەرگ: شاڵاو حەبیبە
- چاپ: یەکەم- ٢٠١٥
- چاپخانە: تاران
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٥٠٠٠ دینار
- بڵاوکار: ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

له بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ١٥٠٥ی ساڵی ٢٠١٥ی پێ دراوە

سەرچاوەی ئەم وەرگێڕانە

Someone I Loved

ANNA GAVALDA

# خۆشم ویست

ئانا گاڤاڵدا

ژوان جەلال

لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی

- گوتت چی؟
- گوتم بە نیازم بیانبەم. بۆ ئەوان وا باشە ماوەیەک دوور بکەونەوە.

خەسووم پرسی:

- ئاخر کەی؟
- ئێستا.
- ئێستا؟ تۆ بیر ناکەیتەوە...
- با، بیر دەکەمەوە.
- تۆ باسی چی دەکەیت؟ وا سەعات یازدەیە! **پیی**، تۆ–
- **سوزان**، من قسە لەگەڵ **کلۆوی** دەکەم. کلۆوی، گوێ لە من بگرە. دەمەوێت دوور بخەمەوە لێرە. دەڵێی چی؟

**هیچ ناڵێم.**

- پێت وایە بیرۆکەیەکی خراپە؟
- نازانم.
- برۆ شتەکانت بێنە. کە هاتیتەوە دەڕۆین.
- من نامەوێ جارێ بچمەوە ماڵەکەی خۆم.
- ئێ مەچۆ. با بڕۆینە ئەوێ هەموو شتێک چارە دەکەین.
- بەس تۆ نا-
- **کلۆوی، کلۆوی،** تکایە. متمانەم پێ بکە.

خەسووم لە بەرهەڵستی بەردەوام بوو:

- بەس- خۆ بەڕاست ناچیت منداڵەکان خەبەر بکەیتەوە! ماڵەکە تەنانەت گەرمیش نەکراوە، هیچیشی بۆ خواردن لێ نییە! هیچی لێ نییە بۆ کچەکان! ئەوان-

ئەو هەستایە پێ.

**ماریان** لەسەر کوشنی ئۆتۆمبیلەکە خەوتووە، پەنجەگەورەی لەسەر قەراغی لێوەکانی. **لوسی** لە تەنیشتییەوە، خۆی گرمۆڵە کردووە.

سەیری خەزوورم دەکەم. قیت دانیشتووە، بە هەردوو دەستی سوکانەکەی گرتووە. لەوەتەی دەرچووین یەک وشەی نەگوتووە. لە لایتی پێشەوەی ئەو ئۆتۆمبیلانەدا کە بەرەو ڕوومان دێن، چێوەی ڕووخساری ئەو دەبینم. پێم وایە کە ئەویش بە قەد من دڵی تەنگە. کە ماندووە. نائومێدە.

هەست بە تێڕوانینەکەم دەکات:

- بۆچی تۆزێ ناخەویت؟ پێویستە نەختێک ئیسراحەت بکەیت، دەزانی- کوشنەکەت بە پشتدا بخە و بنوو. ڕێیەکی درێژمان لەبەرە...

پێی دەڵێم:

- ناتوانم، ئاگاداریی تۆ دەکەم.

ئەو بزەیەکم بۆ دەکات. بە حاڵ لە بزە دەچێت.

- نا... بە پێچەوانەوەیە.

دەگەڕێینەوە سەر بیرکردنەوە تایبەتییەکانمان.

لە پشت دەستەکانمەوە دەگریم.

لە وێستگەی خزمەتگوزاریدا، ئۆتۆمبیلەکەمان ڕاگرتووە. سوود لە غیابی ئەو وەردەگرم، بۆ ئەوەی سەیری مۆبایلەکەم بکەم.

نامە نەهاتووە.

هەڵبەتە.

من چ کەرێکم...

چ کەرێک...

ڕادیۆکە دادەگیرسێنم و دەیکوژێنمەوە.

ئەو دەگەڕێتەوە.

- دەتەوێ بچیتە ژوورەوە؟ هیچت پێویستە؟

قایل دەبم.

دەست بە دوگمەیەکی هەڵەدا دەنێم؛ کوپەکەم پڕ دەبێت لە شلەیەکی دڵتێکەهەڵهێن، کە یەکسەر فڕێی دەدەم. لە مارکێتەکە دەستەیەک دایبی بۆ **لوسی** دەکڕم و فڵچەیەکی ددانیش بۆ خۆم.

ئەو ڕازی نییە ئۆتۆمبیلەکە بخاتە کار تا کوشنەکەم بە پشتدا نەخەم.

لەگەڵ مەکینە کوژاندەوەکەی ئەودا، چاوم کردەوە.

- مەجووڵێ. لەگەڵ کچەکان لێرە بە تا هێشتا گەرمە. دەچم ڕادیەیتەری ژوورەکەتان هەڵدەکەم. ئینجا دێمەوە و دەتانبەم.

دەستم بۆ مۆبایلەکەم برد.

لە چواری بەیانیدا...

من چ کەرێکم.

خەوتنەوە مەحاڵە.

هەرسێکمان لە سیسەمەکەی نەنکی ئەدریاندا پاڵ کەوتووین، ئەوەی کە زۆر خراپ جیرەجیرِی دەکرد. ئەوە سیسەمی ئێمە بوو.

ئێمە هەوڵمان دەدا هەتا بتوانین لە کاتی خۆشەویستیکردندا کەمترین جووڵە بکەین.

هەمووماڵەکە گوێیان لێ دەبێت ئەگەر قۆڵێک یان قاچێک بجووڵێنیت. توانجەکانی کریستینم لە بیرن، کە یەکەم بەیانی بۆ ناشتا هاتینە خوارەوە. ئێمە لە شەرمان سەرمان خستە قاوەکانمانەوە و لەژێر مێزەکەوە دەستی یەکمان گرت.

دەرسی خۆمان وەرگرت. دوای ئەوە، بە بێدەنگترین شێوە لە توانای کەسێکدا بێت، خۆشەویستیمان دەکرد.

دەزانم، کە ئەو لەگەڵ کەسێکی تردا دێتەوە سەر ئەم سیسەمە و کە لەگەڵ ئەو ژنەشدا کاتێک ئیتر لە تاقەتیاندا نامێنێت، ئەم دۆشەکە زلەی سیسەمەکە هەڵدەگرێت و فڕێی دەداتە سەر عەرزەکە.

ئەوە ماریانە، کە لە خەومان هەڵدەسێنێت. وا لە بووکەشووشەکەی دەکات، بەسەر لێفەکەدا بڕوات و چیرۆکێک سەبارەت بە مەساسە فڕیوەکان دەگێڕێتەوە. لووسی دەست لە برژانگەکانم دەدات:

- چاوەکانت هەمووی بە یەکدا نووساون.

لەژێر لێفەکەدا خۆمان دەگۆڕین، چونکە ژوورەکە زۆر ساردە. سیسەمە جیرەجیرکەرەکە ئەوان دەخاتە پێکەنین.

خەزوورم لە چێشتخانەکەدا ئاگری کردووەتەوە. لەوسەری باخەکەوە دەیبینم، لە کەپری داری سووتەنییەکاندا بۆ لقەدار دەگەڕێت.

ئەمە یەکەم جارمە بە تەنیا لەگەڵ ئەودا بم.

هەرگیز لە ئامادەییی ئەودا هەستم بە ڕاحەتی نەکردووە. زۆر دوورەپەرێزە. زۆر بێدەنگە. لەبەر هەموو ئەو شتانەش **ئەدریان** بۆی باس کردم، سەبارەت بەوەی گەورەبوون چەند سەخت بووە لەژێر چاوتێبڕین و ڕەقی و شێتگیریی ئەودا، قوتابخانەی چەند بە ناخۆشی بڕیوە.

لەگەڵ **سوزان**یشدا هەمان جۆر بوو. هەرگیز نەمبینین پێکەوە گەرموگوڕ بن. '**پیێ** زۆر هەستی خۆی پیشان نادات، بەڵام دەزانم چۆنە بۆ من،' **سوزان** ڕۆژێکیان، کە بە دەم چاککردنی فاسۆلیای سەوزەوە، باسی خۆشەویستیمان دەکرد، پێی گوتم.

من سەرم لەقاند، بەڵام تێنەگەیشتم. لەم پیاوە تێنەگەیشتم، کە کەمترین گرنگی بە هەستەکانی دەدا و ڕکێفی دەکردن. هیچ پیشان نەدەیت لە ترسی ئەوەی بە لاواز دەرنەکەویت– من قەت ناتوانم لەوە تێبگەم. لە خێزانی مندا، دەستلێدان و ماچکردن وەک هەناسەدان وەهان.

ئێوارەیەکی زریاناویم لەم چێشتخانەیەدا لە بیرە... **کریستین**، دشەکەم، سکاڵای لە مامۆستای منداڵەکانی دەکرد، پێی دەگوتن بێتوانا و مێشکبچکۆلە. قسەکان لەوێوە چوونەوە سەر مەسەلەی خوێندەواری بە گشتی، ئینجا هیی ئەو بە تایبەتی. جا ئەوکات ئاراستەی با بە شێوەیەکی مەترسیدار گۆڕا. چێشتخانەکە بوو بە هۆڵی دادگایی، **ئەدریان** و **کریستین** وەک داواکاری گشتی و لە قەفەزی گومانباریدا– باوکیان. ترسناک بوو... بریا دوای هەموو شتێکیش سەقفەکە هەڵکەندرایە، بەڵام نا. هەرچیی کینە بوو دووبارە هاتەوە خوارێ و بە چەند مستەکۆڵەیەکی کوشندە لە تەقینەوەیەکی گەورە قوتار بووین.

وەک هەمیشە.

دەکرا چی ڕوو بدات، بەهەرحاڵ؟ خەزوورم ملی نەدەدا. ئەو گوێی بۆ قسەی جەرگبڕی منداڵەکانی دەگرت بێ ئەوەی بە یەک وشەش وەڵام بداتەوە. 'چۆن ئاو لەسەر پشتی قاز دەخزێ، ڕەخنەکانی ئێوەش ئاوا لە من دەکەونە خوارەوە.' ئەو هەمیشە بەر لەوەی لە ژوورەکە بچێتە دەرەوە، بە بزەوە وای دەگوت.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم جارەیان کێشمەکێشەکە شەڕەنگێزانەتر بوو.

ئێستاش دەتوانم دەموچاوە کرژەکەی ببینم، دەستەکانی کە سووراحییە ئاوەکەیان گرتبوو، وەک ئەوەی بیەوێت لەبەر چاوی ئێمەدا بە عەرزیدا بدات.

هەموو ئەو وشانەی کە ئەو هەرگیز نەیدەگوتن بە مێشکی مندا دەهاتن و هەوڵم دەدا تێبگەم. چی دەستی لەو وەشاندووە؟ ئەو کە تەنیا دەبێت بیر لە چی دەکاتەوە؟ ئەی ئەو لە ناخی خۆیدا چۆنە؟

لە نائومێدیدا، **کریستین** ڕووی لە من کرد:

- ئەی تۆ، **کلۆوی**؟ هەموو ئەمانەت بە لاوە چۆنە؟

من ماندوو بووم، دەمویست ئەو ئێوارەیە بگوزەرێت. دراماکانی خێزانەکەیان تا ئێرەم هاتبوو.

بۆ ئەوەی دڵیان ڕابگرم گوتم:

- من؟ پێم وایە، کە پیپ لەناو ئێمەدا ناژی، یانی بەڕاستی نا. ئەو بە جۆرێک لە مەریخەوە هاتووە و لە خێزانی دیپڵدا ون بووە...

ئەوانی تر شانیان هەڵتەکاند و ڕوویان وەرگێڕا. بەڵام خەزوورم نا.

دەستی لە سووراحییەکە شل کردەوە. دەموچاوی ئارام بووەوە و بزەیەکی بۆ من کرد. ئەوە یەکەم جار بوو ببینم بەو جۆرە بزە بکات. ڕەنگە دواجاریش بووبێت. پێم وا بێت ئەو ئێوارەیە گەیشتینە جۆرە لێکتێگەیشتنێک... شتێکی نادیار. من هەوڵم دا بە باشترین شێوە کە بتوانم بەرگری لەو بکەم، مەریخییە سەیر و قژماشوبرنجییەکەم، کە ئێستا بەرەو دەرگای چێشتخانەکە دەڕۆیشت و پاڵی بە عەرەبانەیەکی دەستیی پڕ لە دارەوە دەنا.

...

- هەموو شتێک باشە؟ سەرمات نییە؟
- بەڵێ، بەڵێ، هەموو شتێک باشە، سوپاس.
- ئەی کچەکان؟
- سەیری کارتۆن دەکەن.
- کارتۆن هەیە بەم سەعاتە؟
- هەموو بەیانییەک هەیە لە کاتی پشووی قوتابخانەدا.
- ئۆهـ.. چاکە. قاوەکەت دۆزییەوە؟
- بەڵێ، سوپاس.
- ئەی تۆ چی، **کلۆوی**؟ مادەم باسی پشوو کرا، تۆ نەدەبوو-
- تەلەفۆن بۆ ئۆفیس بکەم؟
- ئێ، هەر گوتم-
- با، با، دەیکەم، من...

دیسان دەستم کردەوە بە گریان.

خەزوورم چاوی لەسەرم لا برد. دەستکێشەکانی داکەندن.

- ببووره، من خۆم لە شتێک هەڵدەقورتێنم، کە هیچ پەیوەندیی بە منەوە نییە.
- نا، وا نییە. مەسەلە ئەوەیە... من هەست دەکەم ون بووم. بە تەواوی ون بووم... من.... تۆ ڕاست دەکەیت، تەلەفۆن بۆ سەرۆککارەکەم دەکەم.
- سەرۆککارەکەت کێیە؟
- هاوڕێیەکە. هیچ نەبێ بە لای منەوە هاوڕێیە. با بزانین...

قژم لە دواوە بە لاستیکێکی کۆنی **لووسی**، کە لە گیرفانمدا بوو، بەست.

- هەر پێی بڵێ چەند ڕۆژێک پشوو وەردەگریت، بۆ ئەوەی ئاگاداریی خەزوورە پیرە تووڕەوترۆکەت بکەیت.

ئەو پێشنیاری کرد.

- باشە... دەڵێم تووڕەوترۆ و دەستەپاچەش. ئەوە وای لێ دەکات جددیتر بکەوێتە بەر گوێ.

لەگەڵ فووکردنیدا لە قاوەکەی، بزەی کرد.

لۆ لەوێ نەبوو. بە منجەمنج چەند وشەیەکم بە هاوکارەکەی گوت، کە لەسەر هێڵێکی تریش پەیوەندیی لەگەڵدا بوو.

تەلەفۆنم بۆ ماڵیشەوە کرد. چووە سەر ئامێری پەیاموەرگرەکە. شتێکی گرنگ نییە.

من پێشبینیی چیم دەکرد؟

ئینجا دووبارە فرمێسک هاتە خوارەوە. خەزوورم هات و خێرا چووە دەرەوە.

*بەردەوام بە*، بە خۆمم گوت، تۆ پێویستت بە گریانێکی باش و تەندروستە. فرمێسکەکانت وشک کە، ئیسفنجەکە بگوشە، جەستەی زل و خەمبارت بچۆڕێنەوە و لاپەڕەکە هەڵدەرەوە. بیر لە شتێکی تر بکەرەوە. پێیەک لە پێش پێیەکی تر دابنێ و دووبارە دەست پێ بکەوە.

ئەوەیە کە هەموان بەردەوام دەیڵێن. بیر لە شتێکی تر بکەرەوە. ژیان بەردەوام دەبێت. بیر لە کچەکانت بکەرەوە. تۆ ناتوانیت هەروا دەستبەرداری خۆت بیت. کۆنترۆڵی خۆت بگرەوە دەست.

بەڵێ، دەزانم، دەزانم، بەڵام: ناتوانم.

واتای 'ژیان' چییە، بەهەرحاڵ؟ بەڕاستی چی دەگەیەنێت؟

منداڵەکانم، چیم هەیە پێشکەشیانی بکەم؟ دایکێکی سەرلێشێواو؟ جیهانێکی لنگەوقووچ؟

من بەڕاستی دەمەوێت بەیانی لە خەو هەستم، خۆم بگۆڕم، نان بخۆم، ئەوان بگۆڕم، نانیان بدەمێ، تا ئێوارە خۆم ڕاگرم و ئینجا بیانخەمە جێوە و ماچی شەوشادیان بکەم. ئەوەم کردووە، هەموو کەس دەتوانێت بیکات. بەس لەمەوبەدوا نا.

بۆ خاتری خوا.

لەمەوبەدوا نا.

- دایە!
- بەڵێ؟

وەڵامم دایەوە، لووتم بە قۆڵی کراسەکەم سڕی.

- دایە!
- لێرەم، لێرەم...

**لوسی** لەبەر دەممدا وەستا، پاڵتۆکەی بەسەر کراسی خەوەکەیدا لەبەر کردبوو. بووکە باربییەکەی بە قژی گرتبوو جۆلانەی پێ دەکرد.

- دەزانی باپیرە چی گوت؟
- نا.
- گوتی دەچین لە مەکدۆناڵد[1] نان دەخۆین.
- بڕوات پێ ناکەم.

وەڵامم دایەوە.

- بەس ئەوە ڕاستییە! خۆی پێی گوتین.
- کەی؟
- تۆزێک لەمەوپێش.
- وا تێگەیشتبووم ئەو ڕقی لە مەکدۆناڵدە...

[1] لە خۆرئاوا، مەکدۆناڵد ناوێکی خراپی هەیە، لەبەر خراپیی کوالیتی و ناتەندروستیی خواردنەکانی.

نا، ڕقی لێی نییه. ئەو گوتی دەچین بۆ شتکڕین
و دوای ئەوەش دەچین بۆ مەکدۆناڵد- تەنانەت
تۆش، تەنانەت ماریانیش، تەنانەت منیش و
تەنانەت ئەویش!

که له پلیکانەکان سەر کەوتین دەستی گرتم.

لێره جلمان زۆر پێ نییه، دەزانی. هەموویمان
له پاریس بیر چوو.
ڕاسته، ئێمه هەموو شتێکمان بیر چوو.

من گوتم.

ئینجا دەزانی باپیره چی گوت؟
نا.
به من و ماریانی گوت، که چووین بۆ بازاڕ
جلمان بۆ دەکڕێت و دەشتوانین خۆمان
هەڵیانبژێرین.
ئۆهـ بەڕاست؟

دایبییەکەیماریانم گۆڕی، وەک هەموو جار ختووکەی سکیم دا، **لوسی** لەسەر لێواری سیسەمەکە دانیشت و بەردەوام بوو لە قسەکردن.

- ئینجا گوتی ئۆکەی...
- ئۆکەی چی؟
- هەر شتێک من داوام کرد...

ئۆهـ نا...

- داوای چیت کرد؟
- جلی بارِبی.
- بۆ بارِبییەکەت؟
- بۆ بارِبییەکەم و بۆ خۆشم. بۆ هەردووکمان وەکوو یەک!
- خۆ ئەو تیشێرتە ناشرینە بریسکانە نا؟
- با، هەموو ئەو شتانەش کە لەگەڵیدا دێنەوە: کابۆی پەمەیی، کالەی پەمەیی بارِبییشی لەسەر بێت، گۆرەوییش بە قردێلەی بچکۆلەوە... دەزانی... ڕێک لەوێدا... قردێلەیەکی بچکۆلە بە پشتەکەیەوە...

ئاماژەی بۆ قوولەپێی کرد.

ماریانم پاڵ خست.

- جووواااانه، تۆ زۆر جووواان دەبیت پێیانەوە!

پێم گوت.

دەمی لار کردبووەوە.

- بەهەرحاڵ، تۆ هەموو شتێکی جوانت پێ *ناشرین*ـە.

من پێکەنیم؛ لۆچە بچکۆلە شایەن بە ستایشەکەی ناوچەوانیم ماچ کرد.

عەزییەکەی کردە بەری و هەموو کاتەکە داڵغەی لێ دابوو.

- جوان دەبم پێوەی، ها؟

- تۆ خۆت هەر جوانی، شیرینەکەم. تۆ خۆت هەر زۆر زۆر جوانی.
- ئا، بەس زیاتر...
- پێت وایە، شتی وا بگونجێت؟

چرکەیەک بیری کردەوە.

- ئا، پێم وایە.
- وەرە، پشتم تێکە.

کچە بچکۆلەکان چ *مەخلووقێکی سەرسووڕهێنن*، من لەگەڵ شانەکردنی قژیدا گوتم. چ مەخلووقێکی سەرسووڕهێنن.

له کاتی سەرەگرتنماندا بۆ ئەوەی پارەی شتەکان بدەین، خەزوورم ددانی بەوەدا نا، کە زیاتر لە دە ساڵە پێی نەخستووەتە سووپەرمارکێتێکەوە.

بیرم لە **سوزان** کردەوە.

هەمیشە لە پشت عەرەبانەی شتکڕینەکەیەوە تەنیایە.

هەمیشە لە هەموو شوێنێک تەنیایە.

دوای ئەوەی پارچە مریشکەکانیان تەواو کرد، کچەکان لە جۆرە قەفەزێکدا کە پڕی تۆپی ڕەنگاوڕەنگ بوو، بارییان کرد. کوڕێکی گەنج پێی گوتن پێڵاوەکانیان داکەنن و من کالە ناشرینەکانی **لوسی**م 'تۆ کچەباڕبیت!' لەسەر کۆشم دانا.

لە هەمووی خراپتر ئەوە بوو، کە پاژنەیەکی ئاویی بەرز و ڕێکیان هەبوو...

- چۆن توانیت شتی وا ناشرین بکڕیت؟
- دڵی زۆر پێی خۆش بوو... من لە هەوڵی ئەوەدام هەمان ئەو هەڵانە لەگەڵ نەوەی داهاتوودا نەکەمەوە. دەبینی، ئەوە وەک ئەم شوێنە وایە... تەنانەت ئەگەر بشکرایە، سێ ساڵ لەمەوپێش قەت **کریستین** و **ئەدریان**م نەدەهێنا بۆ ئێرە. قەت! جا بۆچی؟ ئێستا لە خۆم دەپرسم- بۆچی لەم جۆرە خۆشییانە مەحرووومم دەکردن؟ دواجار، چی لەسەر من دەکەوت؟ پازدە دەقەی ناخۆش؟ پازدە دەقەی ناخۆش چییە بە بەراوردکردنی لەگەڵ ڕووخساری درەوشاوەی منداڵەکانتدا؟

سەری با دا و گوتی:

- من هەموو شتێکم بە هەڵە کردووە. تەنانەت ئەم ساندویچە قۆڕە، ئەوەتا سەرەوخوار گرتوومە، وا نییە؟

پانتۆڵەکەی هەمووی بووبوو بە مایۆنیز.

- **کلۆوی؟**
- بەڵێ.
- دەمەوێت نان بخۆیت. ببورە من وەکوو لەگەڵ سوزاندا قسە بکەم، قسە لەگەڵ تۆدا دەکەم، بەس تۆ لە دوێنێوە هیچت نەخواردووە.
- لەوە ناچێت بیخۆم.

پاڵی دایەوە.

- ڕاست دەکەیت– بەهەرحاڵ چۆن بتوانی شتێکی ئاما بخۆیت؟ کێ دەتوانێ؟ کەس!

هەوڵم دا بزە بکەم.

- باشە، دەتوانی بۆ ئێستا ڕیجیم بکەیت، بەس ئەمشەو، تەواو! ئەمشەو من نانی ئێوارە حازر دەکەم و تۆش دەبێت هەوڵێک بدەیت، باشە؟
- باش.
- ئەی ئەمە؟ ئەم شتە فەزاییيە چۆن دەخورێت، بەهەرحاڵ؟

سەلادێکی بێمانای قەپاتکراوی لە قاپێکی پلاستیکدا هەڵبڕی.

باقیی پاشنیوەڕۆکەمان لە باخەکەدا بردە سەر. کچەکان بە دەوری باپیرەیاندا باڵەفڕەیان بوو، کە لە سەری دابوو جۆلانە کۆنەکە چاک بکاتەوە. من لە دوورەوە تەماشام دەکردن، لەسەر پلیکانەکان دانیشتبووم. سارد، بەڵام سامال بوو. خۆرەکە لە قژیاندا دەدرەوشایەوە و بە لای منەوە جوان بوون.

بیرم لە ئەدریان دەکردەوە، چی دەکات؟

لەم دەقەیەدا دەبێت ئەو لە کوێ بێت؟

لەگەڵ کێیش؟

ئەی ژیانمان، چی بەسەر دێت؟

هەر بیرکردنەوەیەک زیاتر بە ناخیدا دەبردم. زۆر ماندوو بووم. چاوم داخست. خەیاڵم کردەوە، ئەو گەیشتە ئەوێ. دەنگی مەکینەی ئۆتۆمبیلێک لە حەوشەکەدا بوو، هات و لە تەنیشت منەوە دانیشت، ماچی کردم و پەنجەی خستە سەر لێوم بۆ ئەوەی کچەکان سەپرایز بکات. هێشتا دەتوانم هەست بە دەستلێدانە میهرەبانەکەی بکەم لەسەر ملم، دەنگی، گەرمییەکەی، بۆنی پێستی، هەمووی لەوێدان.

هەمووی لەوێدان...

من هەر ئەوەندەم لە سەرە بیریان لێ بکەمەوە.

چەندی پێ دەچێت تا بۆنی کەسێک لە بیر بکەیت، کە خۆشی ویستوویت؟ چەندی پێ دەچێت تا چیتر خۆشت نەوێت؟

خۆزگە کەسێک هەبوایە کاتژمێرێکی لمی پێ بدامایە.

دواهەمین جار کە لە باوەشی یەکتریدا بووین، من بووم ماچی ئەوم کرد. لە ئەسانسێرەکەدا بووین لە شەقامی فلاندرێ.

ئەو بەرهەڵستیی نەکرد.

بۆچی؟ بۆچی هێشتی ژنێک ماچی بکات، کە ئەو چیتر خۆشی ناوێت؟ بۆچی لێوەکانی بە من دا؟ باوەشی؟

هیچ مانایەکی نییە.

جۆلانەکە چاک کرایەوە. پیی نیگایەکی تێ گرتم. سەرم وەرسووڕاند. نامەوێت نیگای ئەو ببینم. من سەرمامە، لووتم ئاوی پێدا دێتە خوارەوە و دەبێت بچم حەمامەکە گەرم بکەم.

- به چی دەتوانم یارمەتیت بدەم؟

خاولییەکی قاپوشککردنەوەی لە ناوقەدی بەستبوو.

- لوسی و ماریان لە جێدان؟
- بەڵێ.
- سەرمایان نابێت؟
- نا، نا، کێشەیان نییە. پێم بڵێ دەتوانم چی بکەم.
- دەتوانی یەک جار بگریت بۆ ئەوەی من شەرمەزار بکەیت... هەستی باشی دەدا بە من، کە بتبینم بێ هیچ هۆیەک دەگریت. ها، ئەمانە لەت کە.

ئەوەی سەرخست و سێ پیازی دایە دەستم.

- پێت وایە من زۆر دەگریم؟
- بەڵێ.

بێدەنگی.

تەختەی شتجنینەکەم لای سنکەکەوە هەڵگرت و لەوبەری ئەوەوە دانیشتم. دیسانەوە دەموچاوی کرژ بوو. تەنیا دەنگێک کە دەهات، لە ئاگردانەکەوە بوو.

- مەبەستم ئەوە نەبوو...
- ببوورە؟
- مەبەستم نەبوو وا بڵێم. پێم وا نییە تۆ زۆر دەگریت، هەر ئەوەندەیە زۆر کار لە من دەکات. تۆ زۆر جوانی کە بزە دەکەیت...

- حەز دەکەیت شتێک بخۆیتەوە؟

سەرم لەقاند.

- با وازی لێ بێنین تۆزێک گەرم بێتەوە، ئەگینا وەکووتر حەیفە... بەشمیلّست بۆ تێکەم تا چاوەڕێی ئەوە دەکەین؟
- نا، سوپاس.
- بۆ نا؟
- حەزم لە ویسکی نییە.
- چەند حەیفە! ئەمە هەر ویسکی نییە. ها، تامی کە.

گڵاسەکەم خستە سەر لێوم؛ تامی شلەی ناو ئەستێی دەدا. چەند ڕۆژ بوو نانم نەخواردبوو، ئیتر لە پڕ سەرخۆش بووم. چەقۆکەم لەسەر توێکڵی پیازەکان دەخزا و سەرم لەسەر ملم دەسووڕایەوە. دەمگوت ئێستا پەنجەیەکی خۆم لێ دەکەمەوە. هەستم بە باشی دەکرد.

- چاکە، وا نییە؟ **پاتریک فرێندال** بۆ یادی لەدایکبوونی شەستساڵیم دایمێ. تۆ پاتریک فرێندالت بیرە؟
- ئاهـ.. نا.

- با، له بیرته. لێره ناسیت، بیرت نایه؟ زەلامێکی کەتەی قۆڵئەستوور بوو.
- ئەوە بوو، کە هێندەی لوسی هەڵدا بۆ ئاسمان تا خەریک بوو بڕشێتەوە؟
- خۆیەتی،

پێی گوتی و گڵاسێکی تری بۆ تێ دەکردم.

- با، له بیرمه.
- زۆرم خۆش لێی دێت؛ زۆر بیری لێ دەکەمەوە. سەیرە، بە یەکێک لە هاوڕێ گیانی بەگیانییەکانی خۆمی دادەنێم و بەحاڵیش دەیناسم.
- تۆ هاوڕێی گیانی بەگیانیت هەن؟
- بۆ ئەو پرسیارە دەکەیت؟
- هەر بۆ ئەوەی پرسیار بکەم، من... نازانم. قەت گوێم لێ نەبووە باسیان بکەیت.

خەزوورم کەوتە گێژەرجنین بە خڕی. تەماشاکردنی پیاوێک کە بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا چێشت لێ دەنێت، خۆشە دایم. بەوجۆرەی پێت بە پێت تەماشای کتێبی

خواردندروستکردنەکە دەکات، وەک ئەوەی **دیلیا سمیت** بەسەر سەرییەوە وەستابێت.

- دەڵێت "گێزەرەکان بە خڕی بە قەبارەی مامناوەندی بجنە." وەک بزانی ئاوا باشە؟
- پێرفێکتە!

پێکەنیم. ملم شل بووبوو، سەرم بەسەر شانمدا کەوتبوو.

- سوپاس. ئێ، لە کوێدا بووم؟ ئۆهـ ئا، هاوڕێکانم... لە ژیانمدا سیانم هەبوون. **پاتریک**م لە سەفەرێکدا بۆ ڕۆما ناسی، جۆرە بێمانایییەکی ئایینی بوو، کەنیسەیەکی ناوچەیی ڕێکی خستبوو. یەکەم سەفەرم بێ ئەوەی دایکوباوکم لەگەڵدا بێت... پازدە ساڵ بووم. یەک وشە تێنەدەگەیشتم لەوەی ئەم پیاوە ئایرشییەی دووهێندەی من دەبوو، پێی دەگوتم، بەس هەر دەمودەست پێکەوە گونجاین. ئەو لە کاتۆلیکیترین خێزانی دنیادا پەروەردە کرابوو و منیش هەر بۆ ئەوەی لەژێر خێزانە خنکێنەرەکەمدا بێمە دەرەوە. دوو بەچکەسەگی ڕاو لە ئینتێرنەڵ سیتی بەرەڵا بووبوون... چ زیارەتێک بوو!

ئێستاش بە جۆشی دەهێنا.

پیاز و گوێزەرەکەی لە مەنجەڵێکی گڵیندا لەگەڵ پارچەی گۆشتی بەرازی بە دووکەڵ ئامادەکراودا خستە سەر ئاگر. بۆنەکەی سەرسوورهێن بوو.

- ئینجا **ژۆن تێرون**، کە دەیناسی و براکەشم **پۆل**، کە تۆ قەت نەتبینیوە چونکە لە ٥٦دا مرد.
- تۆ براکەی خۆتت بە هاوڕێی گیانی بەگیانی دانابوو؟
- ئەو لەوەش زیاتر بوو. **کلۆوی**، ئەوەندەی من تۆ بناسم، ئەوت بناسیایە ستایشیت دەکرد. هەستناسک، قسەخۆش، دڵسۆزی هەموان بوو، هەمیشە مەزاجێکی باشی هەبوو. وێنەی دەکێشا... بەیانی تابلۆ ئاوییەکانیت پیشان دەدەم، لە ئۆفیسەکەمدان. دەنگی هەموو باڵندەکانی دەزانی. بۆ خۆشی سەری دەخستە سەر خەڵک، بەس هەرگیز یەک ڕۆحی ئازار نەداوە. ئەفسووناوی بوو، زۆر ئەفسووناوی بوو. هەموو خۆشیان دەویست.
- بە چی مرد؟

خەزوورم ڕووی بەولادا کرد.

- چوو بۆ هیندۆچین. بە نەخۆشی و نیوەشێتی گەڕایەوە. بە سیل مرد، لە ڕۆژی باستیلی ١٩٥٦دا.

هیچم نەگوت.

- پێویست ناکات پێت بڵێم کە دوای ئەوە، دایکوباوکم هەرگیز هەتا مابوون سەیری یەک نمایشی سوپاییان نەکردەوە. بۆنەکان، ئاگربازییەکان، ئەوە کۆتاییان بوو.

پارچەگۆشتی تری تێ کرد و هەڵیگێڕانەوە، هەموو لایەکانی ئاڵ کردبوون.

- تەماشا، خراپترین شت ئەوە بوو، کە ئەو بە خۆبەخشی بوو بە سەرباز. ئەو کاتە هێشتا لە قوتابخانە بوو. لە ڕووناکیدا شەوقی دەدایەوە. دەیویست لە ئۆفیسی دارستانناسیی نەتەوەییدا کار بکات. عاشقی درەخت و باڵندە بوو. قەت نەدەبوو بچووبایە بۆ ئەوێ. هیچ بەهانەیەکی

نەبوو بچێت. هیچ. ئەو ناسک و لاشەڕ بوو. قسەکەی ژونوی[٢] بە بەڵگە هێنابووەوە و-

- ئەی کەواتە بۆچی چوو؟
- لەبەر کچێک. پەیوەندییەکی عاشقانەی ناشادی نموونەیی. بێمانا بوو؛ کچ بوو تەنانەت ژنیش نەبوو، کچێکی جاحێڵ. پەیوەندییەکی پووچ بوو. تەنانەت ئێستاش کە ئەمەت بۆ باس دەکەم- و هەموو جارێکیش کە بیری لێ دەکەمەوە- پووچیی ژیان دەمدا بە زەویدا. کوڕێکی باش لەبەر خاتری کچێکی جاحێڵی ڕووگرژ دەچێت بۆ جەنگ... بێمانایە. ئەوە شتێکە لە ڕۆمانە خراپەکاندا دەیخوێنیتەوە. چیرۆکێکی ئاوا، وەک زنجیرە تەلەفزیۆنییە دووروودرێژەکان وایە.
- کچەکە ئەوی خۆش نەدەویست؟
- نا، بەس پۆل شێتی بوو. ستایشی دەکرد. لەو کاتەوە ناسیبووی کە کچەکە دوازدە ساڵ بوو؛ نامەی وای بۆ دەنووسی، کە ڕەنگە کچەکە تەنانەت تێشیان نەگەیشتبێت. ئەو بە پۆزلێدانەوە چوو بۆ جەنگ. بۆ ئەوەی کچەکە ببینێت ئەو چ پیاوێکە! ئەو شەوەش پێش

---

[٢] Giono.

ئەوەی بڕوات، ئەو کەرە، بە هەموومانی گوت: "کە پرسیاری لێ کردن، مەچن یەکسەر ناونیشانەکەمی بدەنێ. دەمەوێ خۆم یەکەم کەس نامەی بۆ بنێرم." دوای سێ مانگ، کچەکە شووی کرد بە کوڕی قەسابەکەی شەقامی پاسی.

بە دەیان داوودەرمانی جۆراوجۆری هەڵڕشتە مەنجەڵەکەوە، هەرچیی لە دۆلابەکاندا دۆزییەوە.

موچڕکەم پێدا هات کە بیرم کردەوە ئێستا دیلیا لێرە بوایە چی دەگوت.

- کوڕێکی زلەی بێڕەنگوڕوو، کە ڕۆژەکانی بەوە بەسەر دەبرد لە دیوی دواوەی دوکانەکەی باوکیدا، پارچەگۆشت لە ئێسقان جیا بکاتەوە. دەتوانی وێنای بکەی چ خورپەیەک بوو بۆ ئێمە. ئەو کچە پۆل-ەکەی ئێمەی بۆ ئەم قۆرتەزلە واز لێ هێنا. ئەویش لەوێ بوو، لەوسەری دنیا، ڕەنگە هەر بیری لەم کچە کردبێتەوە، شیعری بۆ نووسیبێت، ئەو کەرە، کچەش، هەموو خەیاڵێکی لای ئەوە بوو لەگەڵ

ئەم گێلەدا بچێتە دەرەوە، کە ڕێی پێ درابوو بۆ شەوی شەممە ئۆتۆمبیلەکەی باوکی بە قەرز وەربگرێت. ڕینۆیەکی فریگاتی شینی ئاسمانی بوو، وەک بیرم بێت... هەڵبەت، ئەو کچە ئازاد بوو لەوەدا ئەمی خۆش نەوێت، بەس پۆل زیاد لە ڕادە بێپەروا بوو، قەت نەیدەتوانی هیچ شتێک بکات ئازایەتیی پێویست نەبێت، بەهرەی تێدا نەبێت. چ خەسار...

- ئەی دوایی؟
- دوایی هیچ. پۆل گەڕایەوە و دایکم قەسابەکەی گۆڕی. ئەو زۆربەی کاتی لەماڵەوە دەبردە سەر، بە زەحمەت دەچووە دەرێ. وێنەی دەکێشا، دەیخوێندەوە، سکاڵای دەکرد کە نەیدەتوانی بخەوێت. ئەشکەنجەی زۆری کێشا، بەردەوام دەکۆکی، ئینجاش مرد. لە بیستویەکساڵیدا.
- قەت باست نەکردبوو.
- نا.
- بۆ؟
- هەمیشە حەزم کردووە لەگەڵ کەسانێکدا باسی بکەم کە ناسیبوویان؛ ئاسانتر بوو...

کورسییەکەمم لە مێزەکە دوور خستەوە.

- من مێزەکە حازر دەکەم. دەتەوێ لە کوێ نان بخۆین؟
- لێرە لە چێشتخانە باشە.

گڵۆپی ناوەڕاستەکەی کوژاندەوە و ڕوو لە یەکتر دانیشتین.

- بەتامە.
- بەڕاست پێت وایە؟ لەوە دەچێت تۆزێک زیاد کولابێت، پێت وا نییە؟
- نا، نا، بەڕاستی، پێرفێکتە.
- تۆ زۆر باشی.
- ئەوە شەرابەکەتە باشە. باسی ڕۆمام بۆ بکە.
- باسی شارەکە؟
- نا، باسی ئەو زیارەتە... تۆ لە پازدەساڵیدا چۆن بوویت؟
- ئۆهـ... چۆن بووم؟ بێعەقڵترین کوڕ بووم لە دنیادا. هەوڵم دەدا لەگەڵ هەنگاوە گەورەکانی

**فریندالّ**دا بڕۆم. بێ پچڕان قسەم دەکرد، باسی پاریسم بۆ کرد، **مۆلین ڕوژ**، هەرچیی بە خەیاڵمدا دەهات دەمگوت و بێشەرمانە درۆم دەکرد. ئەو پێدەکەنی و شتانێکی دەگوت کە من لێی تێنەدەگەیشتم و وای لێ دەکردم لە بەرامبەردا پێبکەنمەوە. کاتی خۆمان بە دزینی پارەی وردەی ناو حەوزی فوارەکان دەبردە سەر و کە کەسێکمان لە ڕەگەزی بەرامبەر دەبینی بە تەوسەوە بزەمان دەکرد. تەواو مایەی بەزەیی بووین، کە ئێستا بیری لێ دەکەمەوە. بیرم نەماوە ئامانجی زیارەتەکە چی بوو. بێشک، بۆ شتێکی باش بوو، بۆنەیەک بوو بۆ نوێژکردن، وەک دەڵێن. ئێستا بیرم ناکەوێتەوە. بۆ من هەناسەیەکی گەورە بوو لە هەوای تازەدا. ئەو چەند ڕۆژە ژیانیان گۆڕیم. تامی ئازادیم کرد. وەک ئەوە وا بوو... نەختێکی ترت بۆ تێ بکەم؟

- بەڵێ، بێزەحمەت.
- تۆ دەبێت لە کۆنتێکستەکە تێبگەیت. ئێمە هەمووومان خۆمان وا پیشان دەدا جەنگێکمان بردووەتەوە. ڕقوکینە زۆر بڵاو بووبووەوە. نەماندەتوانی ناوی هیچ کەس بهێنین، دراوسێیەک، دوکاندارێک، دایکوباوکی

هاوڕێیەک، بێ ئەوەی باوکم تانەیەکیان لێ نەدات- ئەمیان سیخوڕ بوو، ئەویان گومانلێکراو بوو، ترسنۆک بوو، هیچ لەباردانەبوو بوو. ترسناک بوو. ڕەنگە زەحمەت بێ ئێستا وێنای بکەیت، بەس بڕوام پێ بکە، بۆ ئێمەی منداڵ ترسناک بوو. ئێمە لەگەڵ باوکمدا یان قسەمان نەدەکرد، یان زۆر بە کەمی. لەوانەیە هەرە کەمترینەکەی. بەس ڕۆژێکیان، من لێم پرسی "ئەگەر پێت وایە مرۆڤایەتی ئەوەندە ناحەزە، ئەی بۆ چووی شەڕت لەپێناویدا کرد؟"

- وەڵامی چی بوو؟
- هیچ... هەر گوێی خۆی لێ کەڕ کرد.
- بەسە، بەسە، ئەوە زۆرە!
- من لە نهۆمی دووەمی بینایەکدا دەژیام، کە تەواو تاریک بوو، لە ناوچەی شازدەیەمدا نێژرابوو. ئەوەندە خەمناک بوو... دایکموباوکم پارەی ئەوەیان نەبوو لەوێ بژین، بەس ناونیشانەکەی شکۆی هەبوو، دەبینیت. شازدەیەم! ئێمە ترنجێنرابووینە ئەپارتمانێکی ناخۆشەوە، کە قەت هەتاوێکی تێنەدەکەوت، کە دایکیشم کردنەوەی پەنجەرەکانی لێ قەدەغە کردبووین لەبەر ئەوەی وێستگەیەکی پاس

ڕێک لەژێرمانەوە بوو. ئەو تا ڕادەی مردن
لەوە دەترسا پەردەکان... پەردەکان پیس ببن...
ئۆهـ ئەم تۆزە بۆردوە خۆشە وای لێ کردم
وەک ئەو قسە بکەم... من خراپ وەڕز بووم.
لەوە منداڵتر بووم سەرنجی باوکم ڕابکێشم و
دایکیشم بۆ خۆی هەر لەوناوەدا باڵەفڕەی بوو.
زۆر دەچووە دەرێ. "کات بە هاریکاریکردن لە
ناوچەی قەشەنشین بەسەر دەبرێت" ئەو لەگەڵ
هەڵخولاندنەوەی چاوەکانیدا دەیگوت. ئەو
زیادەڕەویی لەوەدا دەکرد، وا ڕەفتاری دەکرد
بە هەڵسوکەوتی هەندێک لە خانمانی کەنیسە
سەری بسوورمێت، کە کەس نەیدەزانی لە
کوێی پەیدا کردوون. دەستکێشەکانی
دادەکەندن و فڕێی دەدانە سەر مێزی هۆڵەکە
وەک ئەوەی ئاگادارمان بکاتەوە، ئینجا
هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا، خۆی با دەدا،
قسەی دەکرد، درۆی دەکرد، هەندێجار خۆی
هەڵەی بە خۆی دەکرد. ئێمەش لێی دەگەڕاین
هەر قسە بکات. **پۆل** ناوی نابوو **سارا بێرنارد**،
دوای ئەوەش کە ژوورەکەی جێ دەهێشت،
باوکم دەستی دەکردەوە بە خوێندنەوەی *لو*

*فیگاغو*[٣] بێ ئەوەی یەک وشە بڵێت... نەختێ پەتاتەت بۆ تێکەم؟

- نا، سوپاس.
- من لە لیسێ ژۆنسۆن-دی-سایی دەژیام، نانی بەیانی و ئێوارەشم لەسەر کرێی شوێنەکە بوو. خۆشم وەک بیناکەم تاریک بووم. کۆمیکی کاتۆلیکی و سەرکێشییەکانی فلاش گۆردۆنم دەخوێندنەوە. هەموو پێنجشەممەیەک لەگەڵ کوڕانی مۆغتولیێ یاریی تێنیسم دەکرد... من... من کوڕێکی زۆر باش بووم، زۆر گەمژە بووم. خەونم دەبینی بە سواربوونی ئەسانسێرەکەوە بۆ نهۆمی شەشەم، هەر بۆ تەماشاکردنێک... باسی سەرکێشییەکت بۆ بکەم! چوونەسەرەوە بۆ نهۆمی شەش! من عەقڵم نوقسان بوو، سوێند دەخۆم.

چاوەڕێی **پاتریک فرێندال** بووم.

چاوەڕێی پاپاکە بووم!

---

[٣] Le Figaro.

هەستا ئاگرەکە جۆش بدات.

- بەهەرحاڵ، گەشتەکە شۆڕشێک نەبوو... هەر ئەوپەڕەکەی تۆزێک گاڵتەوگەپ بوو. هەمیشە پێم وا بوو من... چۆن بڵێم... ڕۆژێک نیرەکە فڕێ دەدەم. بەس نا. هەرگیز. بەردەوام بووم لەوەی ئەو کوڕە زۆر باشە، زۆر گەمژەیە بم. بەس من بۆچی ئەمانە بۆ تۆ باس دەکەم؟ بۆچی وا لە پڕدا ئەو هەموو قسەیە دەکەم؟
- من بووم پرسیارەکەم لێ کردیت.
- ئێ، هێشتا ئەوەش هیچ هۆیەک نییە! خۆ لە وەڕزیدا نەمکوشتووی بە گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانم؟
- نا، نا، بە پێچەوانەوە. زۆرم حەز لێیەتی.

بەیانی ڕۆژی دواتر، یادداشتێکم لەسەر مێزی چێشتخانەکە بینی: *چووم بۆ ئۆفیس. دێمەوە دوایی.*

قاوەی گەرم و لقەدارێکی گەورە لەسەر ئاگرەکە بوون.
بۆچی پێی نەگوتم کە دەڕوات؟

چ پیاوێکی سەیرە... وەکوو ماسی، هەمیشە خۆیت لێ لوول دەدات، لە دەستت دەخزێتە خوارەوە.

کووپێکی گەورەم قاوە بۆ خۆم تێ کرد و بە پێوە خواردمەوە، خۆم بە پەنجەرەی چێشتخانەکەوە نابوو. سەیری سینەسوورەکانم[٤] دەکردن لە دەوری پارچەیەک بەزی بەراز پوورەیان دابوو، کە ڕۆژی پێشووتر کچەکان خستبوویاننە سەر تەختەکورسییەکەی دەرەوە.

خۆر خەریک بوو لەسەر پەرژینەکەوە هەڵدەهات.

من چاوەڕێی ئەوان بووم لە خەو هەستن.ماڵەکە زیاد لە ڕادە بێدەنگ بوو.

حەزم لە جگەرەیەک بوو. ئەوە کەرێتی بوو، چەند ساڵ بوو جگەرەم نەکێشابوو. بەڵام ژیان ئاوایە... تۆ بەهێزیی ئیرادەی خۆت پیشان دەدەیت، کەچی ئینجا لە

[٤] جۆرە باڵندەیەکە.

بەیانییەکی زستانیدا بڕیار دەدەیت چوار کیلۆمەتر لەو سەرمایەدا بە پێ بڕۆیت بۆ ئەوەی پاکەتێک جگەرە بکڕیت. تۆ پیاوێکت خۆش دەوێت و دوو منداڵت لێی هەیە، کەچی لە بەیانییەکی زستانیدا، تێدەگەیت کە ئەو تۆی جێ هێشتووە لەبەر ئەوەی کەسێکی تری خۆش دەوێت. ئەوەش بێتە سەرباری، کە نازانێت چی بڵێت، کە هەڵەیەکە و کردوویەتی.

وەک ئەوەی بە هەڵە زەنگی بۆ ژمارەیەک لێ دابێت: 'ببوورە، هەڵەیەک بوو.'

بۆچی؟ هەر گوێشی مەدەرێ...

وەک بڵقێکی سابوون.

ڕەشەبایە. دەچمە دەرەوە پارچەبەزەکە فڕێ دەدەم.

لەگەڵ کچەکان تەماشای تەلەفزیۆن دەکەم. ڕۆحم چووە، کارەکتەرەکانی ناو کارتۆنەکە وا دێنە پێش چاو زۆر کەر و بەدخوو بن. **لوسی** ناڕەحەت دەبێت، سەری با دەدا، تکام لێ دەکات بێدەنگ بم.

من دەمەوێت باسی **کاندیی** بۆ بکەم.

من کە بچووک بووم، هۆگری **کاندی** بووم.

**کاندی** هەرگیز باسی پارەی نەدەکرد، تەنیا باسی خۆشەویستیی دەکرد. ئینجا دەمم داخست. ئەوە فێرم دەکات وەک **کاندیی** خاتوونی بچکۆلە مامەڵە بکەم...

ڕەشەبا قایمتر و قایمتر هەڵدەکات. واز لە بیرۆکەی چوونم بۆ ناوبازاڕ دەهێنم.

دوانیوەڕۆکەمان لە ئاتیکەکەدا[5] بەسەر برد. کچەکان یاریی خۆگۆڕین دەکەن. **لوسی** باوەشێنی دەموچاوی خوشکەکەی دەکات:

- تۆ گەرماتە، **کۆنتێس**؟

کۆنتێس ناتوانێت جووڵە بکات. یەک دنیا کڵاوی لەسەر کردووە.

بێشکەیەکی کۆن دەهێنینە خوارەوە. **لوسی** دەڵێت دەستێک بۆیاخی تازەی دەوێت.

- پەمەیی؟

لێی دەپرسم.

- چۆنی بۆ چوویت؟
- من زۆر زیرەکم.

---

[5] ژووری بن سەقفی لێژ لە خانووی ڕۆژئاواییدا.

تەلەفۆنەکە لێ دەدات. **لوسی** هەڵیدەگرێت.

لە کۆتاییەکەیدا، گوێم لێیەتی دەپرسێت:

- ئێستا دەتەوێت قسە لەگەڵ دایە بکەیت؟

کەمێک دوای ئەوە دایدەخاتەوە. نایەتەوە بۆ لای ئێمە. لەگەڵ **ماریان** بەردەوام دەبم لە ڕووتکردنەوەی بێشکەکە.

کە دەچمە خوارەوە بۆ چێشتخانەکە سەیر دەکەم لەوێیە، چەناگەی ناوەتە سەر مێزەکە. لە تەنیشتییەوە دادەنیشم.

تەماشای یەکتری دەکەین.

- ڕۆژێک دەبێت تۆ و بابە جارێکی تر یەکترتان خۆش بوێت؟
- نا.
- دڵنیایت؟
- بەڵێ.
- خۆم دەمزانی، بەهەرحاڵ...

هەستا و گوتی:

- دەزانی چی تریش؟
- نا، چی؟
- باڵندەکان هەموو شتەکانیان خواردووە...
- بەڕاست؟ دڵنیایت؟
- ئا، وەرە سەیر کە.

هاتە ئەملای مێزەکەوە و دەستی گرتم.

ئێمە لەبەردەم پەنجەرەکەدا بووین. کچە قژزەردە بچکۆلەکەم لە تەنیشتمەوە بوو. عەزییەکی یەخەداری کۆن و تەنوورەیەکی مۆرانەخواردووی لەبەردا بوو. کاڵە 'تۆ کچەباڕبیت!'ـەکانی ڕێک پڕ بە پێڵاوە تەرەقەدارەکانی نەنەگەورەی بوون. دەستی تەواو پڕ بە دەستە گەورەکەی دایکی بوو. سەیری درەختەکانی باخەکەمان لە پشت ڕەشەباکەوە دەکرد و ڕەنگە بیرمان لە هەمان شتیش کردبێتەوە...

حەمامەکە هێندە سارد بوو، کە نەمدەتوانی شانم لە ئاوەکە دەربهێنم. **لوسی** شامپۆی لە قژمان دا و هەرچیی تەسریحەی شێتانەی قژ بوو بۆی کردین.

- سەیرکە، دایە! شاخ لەسەر سەرت ڕواوە!
- خۆشم دەمزانی.

زۆر پێکەنینهێن نەبوو، بەس منی خستە پێکەنین.

- بۆ پێدەکەنی؟
- چونکە من کەرم.
- بۆچی تۆ کەری؟

به سه‌ماكردنه‌وه خۆمان وشك كرده‌وه.

عه‌زی شه‌و، گۆره‌وی، بلوس، ڕۆب و بلووسی زیاتر.

جووته پیاوه میشلانه بچكۆله‌كه‌م چوونه خواره‌وه شۆرباكه‌یان بخۆن.

له‌و كاته‌دا **به‌با**[٦] یاریی به ئه‌سانسێره‌كه ده‌كرد، له بازاڕێكی گه‌وره‌دا، له‌ژێر ڕوانینی تووڕه‌ی ئه‌سانسێروانه‌كه‌دا، كاره‌با بڕا. **ماریان** كه‌وته گریان.

- بوه‌ستن لێره، ده‌چم گلۆپه‌كان داده‌گیرسێنمه‌وه.
- واهـ! وااااهـ هـ هـ هـ!
- وا مه‌كه، كچه‌باڕبی، خوشكه‌كه‌ت خسته گریان.
- پێم مه‌ڵێ كچه‌باڕبی!
- كه‌واته مه‌كه.

نه باتری بوو و نه فیوزه‌كه. ده‌روازه‌ی په‌نجه‌ره‌كان زرموكوتیان ده‌هات، ده‌رگاكان جیڕه‌جیڕ و سه‌رتاپای ماڵه‌كه نوقمی تاریكی بوو.

---

١ Babar: كاره‌كته‌رێكی چیرۆكی منداڵانه، كراوه‌ته فیلمكارتۆنیش

خوشکانی برۆنتێ، دوعامان بۆ بکەن.

گوتم دەبێت پیی کەی بگەڕێتەوە.

دۆشەکی سەر سیسەمی کچەکانم هێنایە خوارەوە بۆ چێشتخانەکە. مەحاڵ بوو بهێڵم لە سەرەوە بنوون، کە ڕادیەیتەری کارەبایی کار نەکات. ئەوان لە خۆشیدا تەواو خرۆشابوون. مێزەکەمان پاڵ نایە دواوە و جێگە کاتییەکانیانمان لە تەنیشت ئاگردانەکەوە ڕاخستن.

من لە نێوان هەردووکیاندا پاڵ دەکەوم.

- ئەی بەبا؟ تۆ تەواوت نەکرد...
- شووش، ماریان، شووش. ڕێک سەیری پێشی خۆت بکە. سەیری ئاگرەکە بکە. ئەوە چیرۆکەکانت بۆ دەگێڕێتەوە...
- ئا، بەس...
- شششش.

دەمودەست خەویان لێ دەکەوێت.

...

گوێم لەو دەنگانە گرتبوو لەناو ماڵەکەدا دەهات. لووتم دەخورا و دەستم بە چاومدا هێنا بۆ ئەوەی نەگریم.

هەر بیرِم دەکردەوە، ژیانم وەک ئەم جێخەوە وایە. لەق. هاتونەهات. هەڵواسراو.

لەوێدا پاڵ دەکەوم و چاوەڕێم ماڵەکە با هەڵیگرێت.



وا بیرم دەکردەوە، کە من حاشام لێ کراوە.

سەیرە دەربڕینەکان هەر تەنیا دەربڕین نین. تۆ دەبێت ئەزموونی ترسی ڕاستەقینەت کردبێت تا لە مانای 'عارەقی سارد' تێبگەیت، یان دڵەڕاوکێی زۆرت بینیبێت تا بزانی 'سکم پێچی دەخوارد' ڕێک مانای چییە، وایە؟

بۆ 'حاشالێکران'یش هەمان شتە. چ دەربڕینێکی جوانە. ئاخۆ کێ دایهێنابێت.

لە لەنگەرگە حاشا کە.

هاوسەرەکەت بەرەڵا کە.

ڕووکەرە دەریا، باڵە قەترەسییەکانت بکەوە و بڕۆ ئاسۆیەکی تر فەک کە.

نا، بەڕاست، چ شێوازێک هەیە لەوە باشتر بیری لێ بکەیتەوە؟

خەریکە ڕقاوی دەکەومە بەر گوێ؛ ئەوە ئاماژەیەکی باشە. چەند حەفتەیەکی تر و ئینجا بە باشی ناشرین دەبم.

بەڕاستی داوەکە لەوەدایە، کە وا بیر بکەیتەوە تۆ لەنگەرت گرتووە. بڕیار دەدەیت، قەرز وەردەگریت، ڕێکەوتننامە واژۆ دەکەیت و تەنانەت چەند سەرکێشییەکیش دەکەیت. خانوو دەکڕیت، منداڵەکانت دەخەیتە ئەو ژوورانەوە کە بە پەمەیی بۆیاخ کراون و هەموو شەوێک لە باوەشی یەکتریدا دەخەون. تۆ سەرت لەمە دەسوورمێت... ناوی چییە؟ ئەم تێکەڵاوی‌یە. بەڵێ، ناوی ئەوە بوو، کاتێک تۆ بەختەوەر بوویت. تەنانەت کە شتێک کەمتریش بەختەوەر بوویت...

لەوەدا دەکەویتە هەڵەوە، کە پێت وایە تۆ مافی ئەوەت هەیە بەختەوەر بیت. هەر بۆ پێکەنین باشین. ئەوەندە ساویلکەین پێمان وایە، کە تەنانەت بۆ یەک چرکەش بێت ئێمە دەسەڵاتمان بەسەر ژیانی خۆماندا هەیە.

ئێمە ژیانمان لە نێوان پەنجەکانمانەوە دەخزێت، بەس هیچ نییە.

ئەوە هێندە گرنگ نییە...

باشترین شت ئەوەیە زووتر پێی بزانین.

'زووتر' ڕێک کەی دەکات؟

زووتر.

بەر لەوەی بۆ جاری دووەم ژووری نووستنەکان بە پەمەیی بۆیاخ بکەینەوە، بۆ نموونە...

پیێ ڕاست دەکات، بۆچی لاوازیی خۆت پیشان بدەیت؟

هەر بۆ ئەوەی ئازار بدرێیت؟

نەنکم زۆرجار دەیگوت، کە چێشتێکی خۆشی ماڵەوە، باشترین ڕێگەیە بۆ ئەوەی پیاوێکی باش بۆ خۆمان گل بدەینەوە. هەڵبەت، من زۆر لەوە دوورم، نەنە، زۆر. جارێ، نازانم چێشت لێ بنێم، ئینجاش، قەت نەمویستووە کەس بۆ خۆم گل بدەمەوە.

ئێ، کەواتە، سەرکەوتوو بوویت، کچەزا!

بەو بۆنەیەوە تۆزێک کۆنیاک بۆ خۆم تێ دەکەم.

دڵۆپێک فرمێسکی بچکۆلە و ئینجا کاتی خەوە.

ڕۆژی دوای ئەوە لەوە دەچوو زۆر درێژ بێت.

چووین پیاسەیەکمان کرد. سەموونمان دا بە ئەسپەکانی قوتابخانەی ئەسپسوارییەکە و کاتێکی زۆرمان لەگەڵ بردنە سەر. **ماریان** سواری ئەسپێکی قەزەم بوو. **لوسی** حەزی لێ نەبوو.

وام هەست دەکرد بارێکی زۆر قورس بەسەر شانمەوە بێت.

ئێوارە کاتی نمایش بوو. لە بەختی من– هەموو شەوێک نمایشێک لەماڵەکەی مندا هەبوو. لە پرۆگرامی ئەم ئێوارەیەدا: 'ئەو کچە چکۆلەیەی نەیەویست بڕوا' خۆیان کوشت تا من بخلافێنن.

باش نەنوستم.

بەیانیی ڕۆژی دوایی، دڵم لەسەری نەبوو. زۆر سارد بوو.

...

کچەکان هەر کورکەکورکیان بوو.

هەوڵم دا، بەوەی خۆم بکەم بە ژنێکی ئەشکەوتنشینی پێش-مێژوویی، دڵیان خۆش بکەم.

- ئێستا تەماشا کەن، ئەشکەوتنشینەکان ئاواهی نیسکویکیان دروست کردووە... مەنجەڵێک شیریان خستووەتە سەر ئاگرەکە، بەڵێ، ڕێک ئاوا... ئینجا بۆ سەموونی برژاویش؟ لەوە سادەتر نابێ، لەتێک سەموونیان دەخستە سەر کوورەکە و یەڵا، لەسەر بڵێسەکە ڕایاندەگرت... وریا بە! زۆر مەیهێڵەرەوە، ئەگینا دەسووتێ. ئۆکەی، کێ دەیەوێت یاریی ئەشکەوتنشینەکانم لەگەڵ بکات؟

بۆیان مەسەلە نەبوو، برسییان نەبوو. هەموو ئەوەی بۆ ئەوان گرنگ بوو نمایشە تەلەفزیۆنییە کەرانەکانیان بوو.

دەستی خۆم سووتاند. **ماریان**، کە گوێی لە هاواری من بوو، دەستی کردە گریان، **لوسی**یش کاکاوەکەی بەسەر قەنەفەکەدا ڕشت.

دانیشتم و سەرم خستە ناو دەستەکانم.

خەیاڵی ئەوەم دەکردەوە بتوانم سەرم لێ بکەمەوە، بیخەمە سەر عەرزەکە لە بەردەمی خۆمدا دایبنێم و یەک شەقی ئەوەندە قایمی تێ هەڵبدەم، بڕوا بۆ دوورترین شوێنی دنیا.

ئەوەندە دوور، کە ئیتر هیچ کەس بۆی نەدۆزرێتەوە.

بەس من هەر ناشزانم شەق بوەشێنم.

شەقەکەم ڕاست ناڕوات، لەوەیان دڵنیام.

لەو ساتەدا **پیێ** گەیشتەوە.

داوای لێبووردنی کرد، ڕوونی کردەوە کە نەیتوانیوە پێشتر پەیوەندی بکات، چونکە هێڵەکان لە کار کەوتوون و زەرفێک کوراسونی[٧] گەرمی بەژێر لووتی کچەکاندا هێنا.

ئەوان پێکەنین. **ماریان** دەستی ئەوی گرت و **لوسی** پێشنیاری قاوەیەکی پێش-مێژوویی بۆ کرد.

---

[٧] Croissant: هەویرەمەنییە

- قاوەیەکی پێش-مێژوویی؟ بە خۆشحاڵییەوە کرۆماگنۆنە[^] بچکۆلە جوانەکەم!

من فرمێسک کەوتبووە چاومەوە.

ئەو دەستێکی خستە سەر ئەژنۆم.

- **کلۆوی**... تۆ باشی؟

ویستم پێی بڵێم نا، کە بە هیچ جۆرێک باش نیم، بەلام هێندە خۆشحاڵ بووم بە بینینی، کە پێچەوانەکەیم وەلام دایەوە.

- سەموونخانەکە کارەبای هەیە، کەواتە کارەباپڕانەکە گشتی نییە. دەچم بزانم چی بووە... کچان، تەماشای دەرەوە بکەن، کەشوهەوایەکی جوانە! بچن خۆتان بگۆڕن- دەچین بۆ قارچکڕنین. مادەم دوێنێشەو ئەو هەموو بارانە باری، زۆر دەدۆزینەوە!

---

[^] Cro-magnon

کچەکان بە خۆشمەوە... بە تریقەی پێکەنینەوە بە پلیکانەکاندا سەرکەوتین.

چەند خۆشە تەمەنت هەشت ساڵ بێت.

بە پێ هەتا دیڤلس میل ڕۆیشتین، بینایەکی بەدوومی کۆنە، کە چەندەها نەوەی لە منداڵی بچکۆلە خۆشحاڵ کردوون.

پیێ چەند چیرۆکی لە بارەی کونی دیوارەکانەوە بۆ کچەکان گێڕایەوە:

- ئەمە جێلێدانی شاخەکانیەتی... ئەویش، ئەوە شوێنی سمەکانی...
- بۆچی بە سمەکانی شەقی لە دیوارەکە هەڵداوە؟
- ئۆهـ ئەوە چیرۆکێکی درێژە... ئەوە چونکە ئەو ڕۆژە زۆر توورە بووە.
- بۆچی ئەو ڕۆژە زۆر توورە بووە؟
- چونکە زیندانییەکەی هەڵهاتووە.
- کێ زیندانیی ئەو بووە؟
- ئەو کچەی سەموونخانەکە.

- کچەکەی مەدام **پێکۆت**؟
- نا، نا، کچەکەی نا! داپیرە هەرە-هەرەگەورەی ئەو!
- بەڕاست؟

من کچەکانم فێری ئەوە کرد چۆن ماڵەباجێنەی چاخواردنەوە بە کڵاوی بەڕوو بکەن. هێلانەیەکی باڵندەی خاڵی و بەردی کوارتز و قووچەکی سنەوبەرمان دۆزییەوە. گوڵەبەهارەمان چنی و لقەداری بستەمان شکاندەوە. **لوسی** قەوزەی بۆ بووکەشووشەکانی هێنایەوە و ماریانیش بە درێژایی کاتەکە لە قەڵاندۆشکانی باپیری نەهاتە خوارەوە.

دوو قارچکمان هێنایەوە، هەردووکیان دیمەنیان جێی گومان بوو!

لە ڕێی ماڵەوە، گوێمان لە ڕیشۆڵەیەک بوو دەیخوێند و کچێکی بچکۆلەش بە دەنگێکەوە کە حەزی لە شتزانینە دەیپرسی:

- بەس بۆچی دێوەکە نەنکی مەدام پێکوتی گرتبوو؟
- نازانی؟
- نا.
- چونکە ژنێکی زۆر چاوچنۆک بوو، بۆیە!

**لوسی** بە شوڵکێکەوە کەوتە تێکوپێکدانی گژوگیا و بنچکەکان بۆ ئەوەی دێوەکە ڕاو بنێت.

ئەی من چی؟ بە خۆمم گوت. من بە شوڵکێکەوە چیم پێ ڕاو دەنرێت؟

- **کلاوی؟**
- بەڵێ.
- دەمەوێت پێت بڵێم... بە هیوام... یان بڵێم، حەز دەکەم... ئا، ئەوە، حەز دەکەم... حەز دەکەم تۆ

وا هەست بکەیت ئێستاش هەر ماڵ ماڵی خۆتە چونکە... دەزانم تۆ چەندت ماڵەکە خۆش دەوێت. تۆ یەک دنیا شتت لێرە کردووە. لە ژووری نوستنەکاندا، باخەکە... تا تۆ نەهاتبووی باخی تێدا نەبوو، دەزانی؟ بەڵێنم بدەرێ کە دێیتەوە. لەگەڵ یان بەبێ کچەکان...

ڕووم کردە ئەو.

- نا، پیێ، تۆ زۆر باش دەزانیت کە ناتوانم.
- ئەی دارگوڵەباخەکەت؟ چی پێ دەڵێن، بەهەرحاڵ؟ ئەو دارگوڵەباخەی ساڵی پار ڕواندت؟
- شەرمی قەیرەکچان.
- ئا، خۆیەتی، تۆ زۆرت خۆش دەویست...
- نا، من ناوەکەیم خۆش دەویست. گوێ بگرە، ئەمە بۆ خۆی کەم زەحمەت نییە...
- بمبوورە، بمبوورە.
- ئەی تۆ؟ ناتوانیت ئاگاداریی بکەیت؟
- بێگومان! گوتت، شەرمی قەیرەکچان... چۆن ناتوانم؟

تۆزێک زیادەڕۆییی تێدا دەکرد.

لە ڕێگەی ماڵەوە، تووشمان بوو بە تووشی **مارسێل**ی پیرەوە، کە لە بازاڕ دەهاتەوە. پاسکیلەکەی ترسناکانە بەسەر ڕێگەکەدا پێچاوپێچی دەکرد. چۆن توانی لە بەردەمی ئێمەدا بوەستێت، بێ ئەوەی بکەوێتە خوارەوە، ئەوە من هەرگیز نایزانم. **لوسیی** خستە سەر جێی دانیشتنەکە و داوەتی خواردنەوەیەکی سەرپێیی کردین.

مەدام **مارسێل** کچەکانی بە ماچ خنکاند و لە بەردەم تەلەفزیۆنەکەدا بە سەروزەرفێک شیرینییەوە لەسەر کۆشیان، چەقاندنی.

- دایە، ئەو سەتەلایتی هەیە! بڵێ چی! یەک کەناڵ هیچ ناکات کارتۆن نەبێت!

سوپاس بۆ خوا.

بچۆ بۆ ئەوسەری دنیا، بە چڕستان و تەیمان و خەنەقەکاندا هەڵگەڕێ، لووتت بکەوێتە فڵقە، بە حەوشەکەی مارسێلە پیردا بپەڕێوە و بە دەم خواردنی ماشمیلۆ بە تامی شلیکەوە سەیری تەلەفزیۆن بکە.

هەندێجار ژیان جوانە...

زریان، نەخۆشیی شێتیی مانگا، ئەورووپا، ڕاو، مردووەکان و ئەوانەی دەمرن... لە جێیەکی ئەم گفتوگۆیانەدا **پیێ** پرسی:

- **مارسێل**، پێم بڵێ، براکەی منت لە یاد ماوە؟
- کێ، **پۆل**؟ دەبێ بڵێم بەڵێ، ئەو مەیموونە بچکۆلەیە... بەو جۆرە فیکەلێدانەی شێتی کردبووم. وای لێ کردبووم وا بزانم هەرچیی شتە ڕاو دەکرێت! وای لێ کردبووم بە جۆرێک بیر بکەمەوە باڵندە هەن ئێمە لەم ناوچانەدا نیمانە! ئەو ساختەچییە بچکۆلەیە! سەگەکانیش شێت بووبوون! ئۆهـ باشم لە یادە! چ منداڵێکی باش بوو... زۆرجار لەگەڵ قەشەکەدا ملی دەنا بۆ دارستانەکە. ئەو دەیویست هەموو شتێک ببینێ و بزانێ... خوایە، ئەو پرسیارانەی ئەو کوڕە دەیکردن! هەمیشە دەیگوت دەیەوێت بخوێنێت بۆ ئەوەی بتوانێت لە دارستان کار بکات. بیرمە قەشە چۆنی وەڵام دایەوە، "بەڵام، کوڕم، تۆ پێویستت بەوە نییە بچیت بۆ قوتابخانە! چی فێر دەبیت، کە من نەتوانم فێرت بکەم؟" **پۆل** وەڵامی نەدایەوە، گوتی دەیەوێت بۆ هەموو دارستانەکانی دنیا بچێت، بۆ ئەوەی وڵاتانی تر ببینێت، بەناو ئەفریقا و ڕووسیادا

گەشت بکات و بێتەوە بۆ ئێرە و بۆ ئێمەی باس بکات.

پیی گوێی بۆ گرتبوو، هێواش سەری بۆ دەلەقاند، بۆ ئەوەی هانی پیرەمێرد بدات بەردەوام بێت لە قسەکردن.

مەدام مارسێل هەستایە پێ. هاتەوە و دەفتەروێنەیەکی دایە دەستمان.

ئەوە پۆلی بچکۆلە- ڕاستی، من پێی دەڵێم پۆلی بچکۆلە، بەس لەو کاتەدا هێندە بچکۆلە نەبوو- ڕۆژێکیان دای بە من، بۆ ئەوەی سوپاسم بکات، کە گوڵەئاکاسیام بە تایبەت بۆ سوور کردبووەوە. سەیرکە، ئەوە سەگی من بوو.

کە لاپەڕەکانی هەڵدەدایەوە، دەتتوانی سکێچی سەگە تاریەرێکی[٩] بچکۆلە ببینی، کە بەدخوویییەکی کوشندە و فشەکەرییەکی ڕاستەقینەی پێوە دیار بوو.

---

[٩] Terrier.

پرسیم:

ناوی چی بوو؟
ناوی نەبوو، بەس ئێمە دایمە بە چی-لیَ-هاو بانگمان دەکرد، چونکە هەمیشە ڕایدەکرد. بەوەش مرد، ڕاستییەکەی... ئۆهـ.. ئەو سەگەمان خۆش دەویست... عاشقی بووین... زۆر، زۆر. ماوەیەکی زۆرە، ئەمە یەکەمجارە سەیری ئەم وێنانە دەکەم. ئاسایی، هەوڵ دەدەم بەمانەدا نەگەڕێم، ئەمە مەرگێکی زۆری بەسەریەکەوە تێدایە...

وێنە کێشراوەکان نایاب بوون. چی-لیَ-هاو سەگێکی تاریەری قاوەیی بوو، سمێڵەکانی درێژ و ڕەش و برۆکانی بژ.

فیشەکیان پێوە نا... دزی لە دزەکان دەکرد، ئەو بێمێشکە بچکۆلەیە...

هەستام. دەبوو بڕۆین بەر لەوەی بە تەواوەتی تاریک دابێت.

باران براکەمی کوشت. چونکە زۆر زۆریان لەبەر باراندا هێشتبووەوە، دەتوانی وێنای ئەوە بکەیت؟

وەڵامم نەدایەوە. سەرقاڵی ئاگادارکردنی هەنگاوەکانم بووم، هەوڵم دەدا خۆم لە چاڵاوەکان بپارێزم.

کچەکان بێ شێو خەوتن. زۆریان شیرینی خواردبوو.

**بەبا** پیرەژنەکەی جێ هێشتبوو. ئەویش بە تەنیا بوو. دەگریا. لە خۆی دەپرسی، 'دەبێت کەی **بەبا** بچکۆلەکەی خۆم ببینمەوە؟'

**پیێش** هەروەها دڵی تەنگ بوو. ماوەیەکی زۆر لە ژووری خوێندنەوە و نووسینەکەیدا مایەوە، دیارە بۆ تابلۆکانی براکەی دەگەڕا. نانی ئێوارەم دروست کرد. سپاگێتی بە سیوجگەری باڵندەوە، کە **سوزان** لە ماڵەوە ئامادەی کردبوو.

بڕیارمان دابوو ڕۆژی دوای ئەوە، پێشنیوەڕۆکەی بڕۆین. ئەمە دەبووە دواهەمین جار من لەم چێشتخانەیەدا خواردن ئامادە بکەم.

ئەم چێشتخانەیەم زۆر خۆش دەویست. پاستاکەم هەڵدایە ناو ئاوی کوڵاوەوە، جنێوم بە خۆم دەدا کە ئەوەندە عاتیفیم. *ئەم چێشتخانەیەم زۆر خۆش دەویست*... هێی، زاڵ بە بەسەر خۆتدا، کچە زلەکە، چێشتخانەی تر دەدۆزیتەوە...

خۆم چاوترسێن کرد، هەرچەندە چاویشم پڕ بوون لە فرمێسک. ئەوە کەرانە بوو.

**پیی** تابلۆیەکی ئاویی بچووکی خستە سەر مێزەکە. ژنێک خەریکی خوێندنەوە بوو، لە دواوە کێشرابوو.

لەسەر تەختەکورسیی باخێک دانیشتبوو. سەری کەمێک لار کردبووەوە. ڕەنگە خەریکی خوێندنەوە نەبووبێت. ڕەنگە نوستبێت یان داڵغەی لێ دابێت.

ماڵەکەم ناسییەوە. پلیکانەکانی پێشەوە، دەروازەی خڕی پەنجەرەکان و ویستیریا سپییەکان.

- ئەوە دایکمە.
- ناوی چی بوو؟
- ئالیس.

هیچم نەگوت.

- ئەوە بۆ تۆ.

ویستم ڕازی نەبم، بەڵام ئەو دەموچاوی خۆی تووڕە کرد و پەنجەیەکی خستە سەر دەمی. پیێ دیهل کەسێک بوو، کە حەزی لە بەرپەرچدانەوە نەبوو.

- تۆ هەمیشە دەبێت بە قسەت بکرێت، وا نییە؟

گوێی لە من نەگرتبوو.

- قەت کەس وێراوێتی بەرپەرچت بداتەوە؟

من گوتم، لەگەڵ دانانی تابلۆکەی پۆڵدا لەسەر ڕەفەی ئاگردانی ناو دیوارەکە.

- یەک کەسیش نەیتوانیوە. بە هەموو ژیانم.

زمانی خۆمم سووتاند.

خۆی لە مێزەکە کێشایەوە.

- بەبە. چیت حەز لێیە بیخۆیتەوە؟
- شتێک سەرودڵی تۆ بکاتەوە.

لە عەمباری شەرابەکە هاتەوە، دوو بوتڵی وەک ساوای تازەلەدایکبوو بە باوەشەوە گرتبوون.

- شاتۆ شاس-سپلین[١٠]... وەک پێویست گونجاوە. ڕێک ئەوەیە ئێمە دەمانەوێت. دوانم هێنا، یەک بۆ تۆ و یەک بۆ من.
- بەس تۆ شێتی! دەبوو بۆ بۆنەیەکی باشترت هەڵبگرتبان...
- بۆنەیەکی باشتر لە چی؟

کورسییەکەی پاڵ نایە نزیک ئاگرەکەوە.

- لە... نازانم... لە من... لە ئێمە... لە ئەمشەو.

ئەو قۆڵی لە دەوری خۆی پێچابوون بۆ ئەوەی متمانەی بە خۆی بهێڵێتەوە.

- بەڵام، **کلۆوی**، ئێمە بۆنەیەکی مەزنین. ئێمە باشترین بۆنەین لە دنیادا. من لەو کاتەوەی کوڕێکی منداڵ بووم، هاتوچۆی ئەم ماڵە دەکەم، هەزاران ژەمم لەم چێشتخانەیەدا خواردووە و بڕوام پێ بکە دەتوانم کە بۆنەی مەزنم بینی بیناسمەوە.

---

[١٠] Chateau Chasse-Spleen.

شەرابێکی فەرەنسییە.

تۆنێکی خۆ-بەگرنگدانان لە دەنگیدا بوو. حەیفێ.

پشتی وەرسووڕاند و چاوی لە ئاگرەکە بڕی، بێ جووڵە.

- **کلۆوی**، من نامەوێ بڕۆیت...

پاستاکەم کرد بە سووزگییەکدا و.خاولییەکی قاپم دا بەسەریدا.

- تەماشا، بە داخەوەم، بەڵام ئەمە زۆرە. تۆ قسەی بێمانا دەکەیت. تۆ بەس بیر لە خۆت دەکەیتەوە و ئەمەش تۆزێک ماندووکەرە. "من نامەوێ بڕۆیت." چۆن دەتوانیت شتێکی ئەوەندە کەرانە بڵێیت؟ ئەوە من نەبووم کە

ڕۆیشت، باشە؟ تۆ کوڕێکت هەیە، بیرتە؟ ئێ، ئەو بوو کە ڕۆیشت. ئەو بوو. نەتزانیبوو؟ ئەوە چیرۆکێکی باشە. ئاوا دەڕوات- دەتکوژێت. کەواتە، ئەوە... کەی بوو، بەهەرحاڵ؟ گرنگ نییە. ئەو ڕۆژەیان، **ئەدریان، ئەدریان**ی جوان، جانتاکانی پێچانەوە. هەوڵ بدە خۆت بخەیتە شوێنی من- من تووشی خورپە بووم. ئۆهـ ڕاستە، بیرم چوو ئەوە بڵێم، وا دەردەچێت من هاوسەری ئەم کوڕە بم. دەزانی، هاوسەر، ئەو شتە بەسوودەی، کە بۆ هەموو شوێنێک بە دوای خۆتدا بەکێشی دەکەیت، کە بزە دەکات کاتێک ماچی دەکەیت. بۆیە، کەمێک سەپرایز بووم، وەک خۆت دەتوانی وێنای بکەیت... ئەو لەوێدا بوو بە جانتای سەفەرەکانمانەوە لە بەردەم ئەسانسێرەکەدا وەستابوو، ئاهوناڵەی پێ کەوتبوو، سەیری سەعاتەکەی دەستی دەکرد. سکاڵای بوو، چونکە فشاری لەسەرە، ئازیزی داماو! ئەسانسێرەکە، جانتاکان، خانمەکەی و فرۆکەکە، چ گێژاوێک بوو! ئۆهـ بەڵێ! دیارە نەیدەکرا فرۆکەکەی لە کیس بچێت، چونکە عەشیقەکەی سوار بووبوو! دەزانی، عەشیقە، ئەو شتە گەنجە بێسەبرەی، کە کەم کەم

پەستت دەکات. کاتی فیلم نییە، تۆ وا بیر دەکەیتەوە... ئینجاش، شەڕی ناوماڵ زۆر ماندووکەرن... تۆ قەت ئەوە لە خێزانی **دیپل** فێر نەبوویت، وایە؟ هاتوهاوار، فیلمسازاندن، مەزاجگۆڕین، هەمووی بازاڕییە، پێت وا نییە؟ ئەوەیە، بازاڕی. لای دیپڵەکان ئاوایە "نە قەت سکاڵا بکە، نە قەت هیچ ڕوون بکەرەوە" و ئینجا بچۆرە سەر شتی دواتر. ئێستا ئەوە کلاسە.

- **کلۆوی**، بەسیکە هەر ئێستا!

من دەگریام.

- تۆ گوێت لە خۆت نییە؟ گوێت لێیە بە چ شێوازێک قسە لەگەڵ مندا دەکەیت؟ من سەگ نیم، **پیی**. من سەگی نەفرەتیی تۆ نیم. من لە **ئەدریان** گەڕام بڕوات، بێ ئەوەی هەردوو چاوی دەربێنمە دەرەوە، بێدەنگ دەرگاکەم داخست و ئێستا من لێرەم، لە بەردەمی تۆ، لە بەردەمی منداڵەکانم. خۆم ڕاگرتووە. هەر ئەوەندە خۆم پێ ڕادەگیرێت، تێدەگەیت؟ تێدەگەیت ئەوە یانی چی؟ کێ گوێی لێم بوو لە دڵشکستیدا دەملووراند؟ کێ؟ چا هەوڵ مەدە

ئێستا وام لێ بکەیت خەم بۆ تۆ و گرفتە بچکۆلەکانی تۆ بخۆم. تۆ ناتەوێت من بڕۆم... ئۆهـ پیێ... بە داخەوە من ناچارم لە فەرمانت دەرچم... ئەوە داخێکی گەورەیە... ئەوە...

ئەو مەچەکەکانمی گرتبوو و بە هەموو هێزی خۆی دەیگوشین. قۆڵەکانمی بە توندی گرت.

- بەرمدە، تۆ ئازارم دەدەیت! سەرلەبەری ئەم خێزانە ئازارە بۆ من! پیێ، بەرمدە.

بە ئەستەم فریا کەوت دەستم لێ شل کات، پێش ئەوەی سەرم بکەوێتە سەر شانی.

- ئێوە هەمووتان ئازارم دەدەن...

من لەسەر شانی ئەو دەگریام، بیرم چووبوو دەبێت چەندم نارەحەت کردبێت. پیێ کە هەرگیز دەستی بەر کەس نەدەکەوت. دەگریام، جارجارە بیرم دەکردەوە،

ئەگەر تۆزێک ڕۆن بەسەر سپاگێتییەکەدا نەکەم، وای لێ دێت نەخورێت.

ئەو گوتی:

ئێستا، ئێستا...

گوتی:

تکایە بمبوورە.

و گوتی:

منیش بە قەد تۆ دڵتەنگم...

چیتر نەیدەزانی دەستەکانی چی لێ بکات.

دواجار، چووە ئەولاوە مێزەکە ئامادە بکات.

- به خۆشیی تۆ، **کلۆوی**.

گلاسەکەم لە گلاسەکەی ئەو دا.

- بەڵێ، بە خۆشیی من.

من بە خەندەیەکی دروستکراوەوە گوتم.

- تۆ کچێکی سەرسووڕهێنیت.
- بەڵێ، سەرسووڕهێن. ئینجا ئازایەتییەکیشم تێدایە متمانەی پێ بکەیت... چی ماوە؟
- قسەخۆش.
- ئۆهـ ڕاستە، خەریک بوو بیرم بچێ. قسەخۆش.
- بەڵام ناحەقیت.

هیچم نەگوت.

- تۆ کەمێک ناحەقی دەکەیت، پێت وا نییە؟

بێدەنگی.

- پێت وایە کە من بەس خۆمم خۆش دەوێت؟
- بەڵێ.
- ئێ، کەوابێ، تۆ بەس ناحەق نیت، تۆ کەریشیت.

گلاسەکەم هەڵبڕی.

- ئۆهـ ئەوەیان، خۆشم ئەوەم دەزانی... تۆزێکی ترم لەو شەرابە خوایانە نایابە بۆ تێکە.

- تۆ پێت وایە من پیرەزۆڵێکم، وا نییە؟
- با.

سەرم لەقاند. لە ناجسنیمەوە نەبوو، هەر دڵم تەنگ بوو.

ئەو هەناسەی هەڵکێشا.

- بۆچی من پیرەزۆڵێکم؟
- چونکە تۆ کەست خۆش ناوێت. تۆ قەت خۆت بە دەستەوە نادەیت. تۆ قەت ئامادەییت نییە، قەت بەڕاستی لەگەڵ ئێمەدا نیت. قەت نایەیتە گفتوگۆ و کەرێتییەکانی ئێمەوە، قەت بەشداری قسە بێفەڕەکانی سەر مێزی نانخواردن نابیت. چونکە قەت میهرەبان نیت، چونکە قەت قسە ناکەیت و چونکە بێدەنگییەکەت لەوە دەچێت بە سووک سەیری ئێمە بکەیت. چونکە-
- بەسە، بەسە. ئەوە بەسە، سوپاس.
- ببوورە، من وەڵامی پرسیارەکەتم دەدایەوە. تۆ لێت پرسیم بۆچی پیرەزۆڵێکی و منیش پێت دەڵێم. لەگەڵ ئەوەشدا، تۆ هێندە پیر نیت بۆ ئەوانە...

- لوتفت هەیە.
- شایەنی نییە.

بزەیەکی ناسکم بە لاقرتێوە بۆ کرد، ددانەکانم پیشان دا.

- بەس ئەگەر من بەو جۆرە بم تۆ وەسفی دەکەیت، بۆچی تۆ دەهێنم بۆ ئێرە؟ بۆچی ئەو هەموو کاتە لەگەڵ تۆدا بەسەر دەبەم و—
- خۆت باش دەزانیت بۆچی.
- بۆ؟
- چونکە هەستی شەرەفت تێدایە. ئەو مۆراڵە بەرزەی خێزانە باشەکان هەیانە. حەوت ساڵە من بە تۆوە هەڵواسراوم و ئەمە یەکەمجارە سەرنجێکم بدەیت. با پێت بڵێم من چۆنی دەبینم. من لە تۆدا نە خێرەومەندی و نە سەخاوەت نابینیم. جوان دەیبینم مەسەلە چییە. کورەکەت شتێکی کەرانەی کردووە و تۆش— تۆ بە دوای ئەودا هاتووی، تۆ زیانەکان پاک دەکەیتەوە. تۆ بە نیازی بە باشترین شێوەیەک کە بتوانی پلاستەر لەو شوێنانە بدەیت کە قڵیشیان بردووە. چونکە تۆ حەزت لە قڵیش

نییە، وایە، **پیی**؟ ئۆهـ نا! تۆ هیچ حەزت لێیان نییە...
با شتێکت پێ بڵێم. من پێم وایە تۆ منت لەبەر ئەوە هێناوە بۆ ئێرە، لای خەڵک خۆت بە جۆرێک نیشان نەدەیت. کوڕەکە هەموو شتێکی وێران کردووە، ئێ، با ددان جیڕ کەینەوە و شتەکان چارە بکەین بێ ئەوەی هەراوهوریای لێ بکەویتەوە. جاران، کە ئەو گووە بە ئۆتۆمبیلە سپۆرتەکەی کێڵگەی چەوەندەری خەڵکی ناوچەکەی دەشێلا، تۆ دەچوویت لێیانت دەکڕییەوە و ئەمڕۆش هاتووی بووکەکەت دەخلافێنی. من چاوەڕێی ئەو ساتەم کە تۆ ئەو ڕەفتارە بەئێشە بنوێنیت و پێم بڵێی کە دەتوانیت پشت بە من ببەستی. یانی، بۆ پارە. *تۆ لە بارودۆخێکی کەمێک سەختدایت، وا نییە؟* بەس کچێکی گەورەی وەکوو من کڕینەوەی سەختترە لە کێڵگەیەکی چەوەندەر...

ئەو هەستایە پێ.

- کەواتە بەڵێ... ئەوە ڕاستە. تۆ کەریت. چ شتێکی ناخۆشە پێی بزانیت... بێنە، قاپەکەتم بدەرێ.

ئەو لە پشتمەوە بوو.

- پێت وێنا ناکرێت ئەوە چەندم ئازار دەدات. لەوەش زیاتر، تۆ بە قووڵی بریندارت کردم. بەس لێت ناگرم– دەیخەمە ئەستۆی ئەو ئازارەی تۆ هەستی پێ دەکەیت...

قاپێکی هەڵماویی لە بەردەممدا دانا.

- بەس یەک شت هەیە ناتوانی بیلێیت، بەس یەک شت...
- چییە ئەوە؟

من لەگەڵ هەڵبڕینی چاومدا گوتم.

- هەرچییەک دەکەیت چەوەندەرەکان مەخەرە ئەم مەسەلەیەوە. زۆریش فشار ببەیت تا چەند میلیش یەک دانە کێڵگەی چەوەندەر لەم ناوەدا نادۆزیتەوە...

زۆر لەخۆڕازییانە خۆشی لە خۆی دەهات.

- ممم، خۆشە... دوایی بیری خواردنەکانم دەکەیت، مەگەر نا؟
- خواردنەکانت، با. بەس بۆ باقییەکەی، سوپاس بەس سوپاست ناکەم... ئیشتیهات نەهێشتم...
- بەڕاست؟
- نا.
- خەریک بوو نیگەرانم بکەیت!
- لەوە زیاتری دەوێت، لەم پاستا نایابەم دوور بخەیتەوە.

کردی بە قاپەکەدا و چنگاڵێکی پڕ پاستای پێکەوەنووساوی هەڵبڕی.

- ممم، ئەمە چی پێ دەڵێن؟ *ئێل دۆنتی*...

من پێکەنیم.

- حەزم لێیە کە پێدەکەنیت.

بۆ ماوەی خولەکێکی درێژ قسەمان نەکرد.

- تووڕەیت؟
- نا، تووڕە نیم. شێواوم، بەڕاستی...
- بمبوورە.
- سەیرکە، من وا هەست دەکەم ڕووبەڕووی شتێک بوومەتەوە سەری لێ دەرناکرێت. جۆرە گرێیەکی گەورە...
- حەز دەکەم-
- بوەستە، بوەستە. بهێڵە قسە بکەم. من دەبێت ئێستا ئەمە چارەسەر بکەم. زۆر گرنگە. نازانم ئەگەر تۆ تێبگەیت، بەس دەبێت گوێم بۆ بگریت. پێویستم بەوەیە شوێن تاڵەدەزوویەک بکەوم، بەس کامیان؟ نازانم، نازانم چۆن و لە کوێوە دەست پێ بکەم. ئۆهـ خوایە، ئەمە زۆر ئاڵۆزە... ئەگەر تاڵەدەزوویەکی هەڵە هەڵبژێرم یان زۆر قایم ڕایبکێشم، لەوانەیە گرێکە لەوەش توندتر بکاتەوە. لەوانەیە ئەوەندە خراپ گرێ بخۆم، کە نەتوانرێت هیچ شتێک بکرێت و تۆش کاس بکەم. تەماشا، **کلاوی**، ژیانی من، هەموو ژیانی من وەکوو ئەم مشتە

نوقێنراوە وایە. من ئەمەتام لێرە لە بەردەمی تۆ لەم چێشتخانەیەدا. تەمەنم شەستوپێنج ساڵە. هیچ سەرنجڕاکێش نیم. من هەر پیرەزۆڵێکم تۆزێک لەمەوپێش تۆ لەرزاندت. لە هیچ تێنەگەیشتووم و هەرگیز نەچوومە سەرەوە بۆ نهۆمی شەشەم. من لە سێبەری خۆم دەترسام و ئێستا ئەوەتام، ڕووبەڕوو لەگەڵ بیرۆکەی مردنی خۆمدا و... نا، تکایە، پێم مەبڕە... ئێستا نا. با ئەم مشتە بکەمەوە. هەر یەک تۆز.

گڵاسەکانمانم پڕ کردنەوە.

- بەوەی زۆرترین ناحەقییە، دڕندانەترینە دەست پێ دەکەم... ئەوە، لەگەڵ تۆدا...

خۆی شل کرد پاڵ بە کورسییەکەوە بداتەوە.

...

- یەکەم جار تۆم بینی، تۆ بە تەواوی شین هەڵگەڕابوویت. بیرمە چەند بە دڵمدا چوویت. ئێستاش دەتوانم بتبینم لە ڕاڕەوەکەدا وەستاوی... **ئەدریان** گرتبوویتی، دەستێکت هێنا، کە سەرما تەواو ڕەقی کردبوو. نەتتوانی تەوقەم لەگەڵ بکەیت، نەتتوانی قسە بکەیت، بۆیە منیش وەک ئاماژەیەک بۆ بەخێرهێنانت قۆڵتم گوشی و تا ئێستاش دەتوانم ئەو پەڵە سپییانە ببینم، کە پەنجەکانم لەسەر مەچەکت جێیان هێشت. **سوزان** شڵەژابوو، بەس **ئەدریان** بە پێکەنینەوە پێی گوت، "سەمفورەیەکم[١١] بۆ هێناویت!" ئینجا بردیتییە سەرەوە و کردیتی بە حەمامێکی گەرمی سووتێنەردا. چەند مایتەوە لەوێ؟ بیرم نەماوە؛ بەس ئەوەم بیرە **ئەدریان** هەر بە دایکی دەگوت، "ئاسان وەریگرە، دایە، ئاسان وەریگرە! هەر کە کچەکە کولا، دەتوانین بیخۆین." ئەوە ڕاستە، ئێمە برسیمان بوو. من برسیم بوو، بەهەرحاڵ. تۆش دەمناسیت، دەزانیت پیرەزۆڵەکان کە برسییان دەبێت چۆنن... هەر ئەوەندەی مابوو بڵێم، با ئێمە نانی

[١١] Smurfette.

خۆمان بخۆین، کە تۆ هاتیتە ژوورەوە، بە قژی تەڕ و بزەی شەرمنەوە، کراسێکی شەوی کۆنی **سوزان**ت لەبەر کردبوو.
ئەمجارە، ڕوومەتەکانت سوور، سوور، سوور بوون....
لەسەر نانخواردن پێتان گوتین، کە ئێوە لە سەرەی سینەمادا یەکتان ناسیوە، کە بۆ فیلمی *یەکشەممەیەک لە لادێ* بووە و کە جێ نەماوە و **ئەدریان**، فشەکەرە- لە خێزانەکەماندا ئەوە هەیە- لە بەردەم ماتۆڕەکەیدا وەستاوە و پێشنیاری یەکشەممەیەکی ڕاستەقینەی لە لادێ بۆ کردوویت. پێشنیارەکە وا بووبوو، ئەگەر ڕازیت باشە و ڕازیش نیت چش و تۆش ڕازی بوویت، ئەوەش ڕوونی کردەوە بۆچی ئەو سەرما پلەبەرزە لێی دابوویت، چونکە تۆ بە تیشێرتێکەوە پاریست جێ هێشتبوو، کە لەژێر کۆتەکەتەوە لەبەرتدا بوو. **ئەدریان** خەریک بوو دەیخواردیت بە چاو، کە ئەوەش زەحمەت بوو بۆ ئەو چونکە تۆ سەرت لەسەر مێزەکە هەڵنەدەبڕی. دەمتوانی چاڵێک لە ڕوومەتتدا ببینم کە باسی تۆی دەکرد و ئێمە وامان وێنا دەکرد تۆ بزەمان بۆ دەکەیت... هەروەها ئەو

کاله سەیروسەمەرانەشم لە بیرە کە لە پێتدا بوون...

- کالەی زەرد بوون، ئۆهـ خوایە!
- وایە. بۆیە مافت نییە ڕەخنە لەوانە بگریت کە ئەو ڕۆژە بۆ **لوسی**م کڕی... بیری ئەوەم دەخاتەوە، دەبێت پێی بڵێم... "گوێ لەو مەگرە، شیرینەکەم، کە من دایکتم ناسی، کالەی زەردی لە پێدا بوو، بە قەیتانی سوورەوە..."
- تەنانەت قەیتانەکانیشیت لە بیرە؟
- هەموو شتێکم لە بیرە، **کلۆوی**، هەموو شتێک. قەیتانە سوورەکان، ئەو کتێبەی لەژێر دارگێلاسەکەدا دەتخوێندەوە، کاتێک **ئەدریان** خەریکی چاککردنەوەی ماتۆڕەکەی بوو...
- کە چی بوو؟
- جیهان *بە پێی کارپ*، وایە؟
- ڕێک وایە.
- ئەوەشم لە بیرە کە خۆت ویستت پلیکانە بچکۆلەکان بۆ **سوزان** بسڕیتەوە، کە دەچووە سەر عەمبارە کۆنەکە. نیگا بەسۆزەکانی ئەوم لە بیرە کە تێی دەگرتیت، کاتێک تەماشای دەکردی خۆت بە دڕکەکانەوە ماندوو کردبوو. دەتتوانی "بووکەکەم؟ بووکەکەم؟" لە گڵۆپی نیۆنی گەورە و بریسکاوەدا لە پێش چاوەکانی

ئەودا بخوێنیتەوە. من بە ئۆتۆمبیل بردمیت بۆ مارکێتی سەینت-ئاماند، پەنیری بزنت کڕی و ئینجا پێکەوە لە قاوەخانەیەکی گەڕەکەکەدا مارتینیمان خواردەوە. گوتارێکت لەسەر ئاندی وۆهۆڵ خوێندەوە وا بزانم، کاتێک من و **ئەدریان** یاریی فیشەمان دەکرد...

- شتێکە بڕوای پێ ناکرێت، چۆن دەکرێت کە تۆ هەموو ئەوانەت لە بیر مابێت؟
- ئاهـ.. شایستەی پێداهەڵگوتن نیم... ئەوە یەکێکە لەو چەند شتەی هاوبەشن لە نێوانماندا...
- مەبەستت لەگەڵ **ئەدریان**؟
- بەڵێ...
- بەڵێ.

هەستام پەنیرەکە بێنم.

- نا، نا، قاپەکان مەگۆڕە، پێویست ناکات.
- هەڵبەت پێویست دەکات! دەزانم تۆ چەندت ڕق لەوەیە پەنیرەکەت لە هەمان قاپدا بخۆیت.
- ڕقم لەوەیە؟ ئۆهـ.. ئەوە ڕاستە... شتێکی ترە لەوانەی پیرەزۆڵەکان هەیانە، وایە؟
- ئممم... بەڵێ، وایە.

دەموچاوی مۆن کردبوو، کە قاپەکەی دایە دەستم.

- برۆ بە جەهەندەم.

چاڵێک لەسەر ڕوومەتی دەرکەوت.

- بێگومان، ڕۆژی ئاهەنگەکەشتانم لە بیرە... تۆ قۆڵت کرد بە قۆڵمدا و یەجگار جوان بوویت. یاریت بە قژت دەکرد. هەر لە هەمان ئەو گەڕەکەی سەینت ئاماند دەپەڕینەوە، کە تۆ بە گوێمدا چرپاندت: "تۆ دەبوو بمرفێنیت؛ ئەو پێڵاوە قۆڕانە لە جامی ئۆتۆمبیلەکەتەوە فڕێ دەدەمە دەرێ و دەچین بۆ شی ڤێت و خواردنی دەریایی دەخۆین..." ئەو نوکتە بچکۆلەیەت سەری منی سووڕاندەوە. دەستکێشەکانم توند کردنەوە. هانێ، یەکەمجار بۆ خۆتی تێکە...
- نا، نا، خۆت یەکەمجار.
- چی ترت پێ بڵێم؟ بیرمە ڕۆژێکیان، ڕێک کەوتبووین لە کافێی ژێر ئۆفیسەکەم یەکتر ببینین، بۆ ئەوەی ئەسکوێ بوو شتێکی وەها بوو وەرگرمەوە لێت، کە لە سوزانت قەرز کردبوو. دەبێت ئەو ڕۆژە ناپەسەند هاتبێتمە بەر چاوی تۆ، پەلەم بوو، مێشکم مەشغووڵ

بوو... تۆ هێشتا چایەکەت تەواو نەکردبوو من ڕۆشتم. سەبارەت بە کارەکەت پرسیارم لێ کردیت و ڕەنگە گوێم لە وەڵامەکانت نەگرتبێت. ئەو شەوە لە کاتی نانی ئێوارەدا، کە **سوزان** لێی پرسیم، چی تازە هەیە؟" بێ ئەوەی زۆر بڕوام پێی بێت، وەڵامم دایەوە، "**کلۆوی** دووگیانە." "ئەو پێی گوتی؟" "نا، دڵنیاش نیم ئەو خۆی بیزانێت." **سوزان** شانی هەڵتەکاند و چاوی هەڵخولاندەوە، بەس من ڕاستم کرد. دوای چەند حەفتەیەک، تۆ هەواڵە خۆشەکەت پێ ڕاگەیاندین...

- تۆ چۆن بۆی چوویت؟
- نازانم... وام هاتە پێش چاو، کە ڕەنگی پێستت گۆڕابێت، کە لەپەلوپۆکەوتنەکەت بە هۆی شتێکی ترەوە بێت...

هیچم نەگوت.

- دەتوانم ئیتر لە سەری بڕۆم. چاوت لێیە، تۆ ناحەقیت کرد- گوتت چی؟ کە من ئەم هەموو کاتە، ئەم هەموو ساڵە، قەت بایەخم بە تۆ نەداوە. ئۆهـ **کلۆوی**، هیوادارم شەرم لە خۆت بکەیت.

بە گاڵتەوە، دەموچاوێکی تووڕەی نیشان دام.

- لە لایەکی تریشەوە، من خۆویستم، لەوەیاندا ڕاست دەکەیت. پێم گوتی کە من نامەوێ بڕۆیت، چونکە من نامەوێ بڕۆیت. من بیر لە خۆم دەکەمەوە. تۆ لە کچەکەی خۆم نزیکتری لێمەوە. کچەکەی خۆم قەت پێم ناڵێت، کە من پیرەزۆڵێکم، هەر بۆ خۆی لە خەیاڵی خۆیدا وا دادەنێت من کەرم!

هەستا خوێ بهێنێت.

- هێی ئێستا... چیتە؟
- هیچ. هیچ نییە.
- با، هەیە. تۆ دەگریت.
- نا، من ناگریم. تەماشاکە، من ناگریم.
- با، دەگریت. تۆ دەگریت! گلاسێک ئاوت بۆ بێنم؟
- بەڵێ.
- ئۆهـ **کلۆوی**... من نامەوێت تۆ بگریت. ئەوە دڵم تەنگ دەکات.
- ئەها، چاوت لێیە! هەر خەمی خۆتتە! شتی وەک تۆ مەحاڵە...

هەوڵی تۆنێکی گاڵتەبازانەم دا، بەڵام گلۆپی چڵم لە لووتم هاتنە دەرێ. شایستەی بەزەیی بووم.

پێکەنیم. گریام. ئەم شەرابە بە هیچ جۆرێک سەرودڵی منی نەدەکردەوە.

- دەبوو قەت باسی ئەو هەموو شتەت بۆ نەکەم...
- نا، قەینا. ئەوانە یادەوەریی منیشن... هەر هێندەیە دەبێت لەگەڵ هەموو ئەمەدا ڕابێم. ڕەنگە بۆ تۆ قورس بێ تێبگەیت، بەس ئەمە بە تەواوەتی تازەیە بۆ من. دوو حەفتە لەمەوپێش، من هێشتا لەگەڵ تۆدا دەژیام یان ژنێکی ئاسایی بووم و دایک بووم. لە مێترۆدا دەفتەری یادداشتەکانم هەڵدەدایەوە، پلانم بۆ بۆنەی چاخواردنەوە دادەنا و لەگەڵ بیرکردنەوە لە هۆڵیدەیەکان، نینۆکەکانم ڕێک دەکردنەوە. لە خۆمم دەپرسی، "کچەکان ببەین باشە، یان هەر خۆمان بە جووت بڕۆین؟" لەو جۆرە شتانە...

ئەوەشم لە دڵی خۆمدا دەگوت، "وا باشە ئەپارتمانێکی تر بدۆزینەوە؛ ئەمەی هەمانە

خۆشە، بەس زۆر تاریکە..." چاوەڕێی **ئەدریان** بووم باشتر ببێت، چونکە دەمبینی، کە لەم دواییانەدا ئەو خۆی نەبوو... تووڕە، هەستەوەر، ماندوو... من نیگەرانی بووم؛ دەمگوت، "کوشتوویانە لە کارەکەی، ئەم هەموو سەعاتە زۆرە چییە کاری پێ دەکەن؟"
ئەو ڕووی وەرگێڕایە لای ئاگرەکە.



- لەگەڵیدا دەژیام یان ئاسایی بووم، بەس زۆر زیرەک نەبووم، وایە؟ چاوەڕێم دەکرد بێتەوە نانی ئێوارەی لەگەڵدا بخۆم. چەندەها سەعات چاوەڕێم دەکرد. هەندێجار تەنانەت هێندەم چاوەڕێ دەکرد خەوم لێ دەکەوت... سەرەنجام دەهاتەوە، دەموچاوێکی خەمگینی پێوە بوو، کلکی لە نێوان قاچیدا. باوێشکم دەدا و خۆم دەکێشایەوە و پێشی دەکەوتم بۆ چێشتخانەکە، ئەو ناوەم شلۆق دەکرد. ئەو برسی نەبوو، هەڵبەتە، ئەوەندەی شەرەف هەبوو کە ئیشتیهای نەبێت. یان لەوانەیە پێشتر نانیان خواردبێت؟ زۆرتر ڕێی تێ دەچێت...

دەبێت دۆزەخ بووبێت بۆ ئەو بەرامبەری من دانیشێت! دەبێت چ فیلمێک بووبم بە سرووشتە خۆشەکەم و چیرۆکی زنجیرە تەلەفزیۆنییە دوورودرێژەکانمەوە دەربارەی ڕووداوەکانی گەڕەکی فێرمین گیدۆن. ئەشکەنجە بووە بۆ ئەو، کە بیری لێ دەکەمەوە... **لوسی** ددانێکی کەوت، دایکم تەندروستیی باش نییە، کچە پۆلۆنییەکەی لەلەی **ئارسەری** بچکۆلەیە، لەگەڵ کوڕی دراوسێکەیاندا دەچێتە دەرەوە، ئەم بەیانییە پەیکەرەکەمم تەواو کرد، **ماریان** قژی بڕیوە و زۆر ناشرینە، مامۆستاکە تەبەقە-هێلکەی دەوێت، تۆ ماندوو دیاریت، ڕۆژێک پشوو وەرگرە، دەستتم بدەرێ، نەختێک سپێناخی ترت بۆ تێکەم؟ داماوە... جۆرێک لە ئەشکەنجە بۆ هاوسەرێکی ناپاک و بەڵام بەویژدان. ئەشکەنجەی چی... خۆ من گومانم لە هیچ نەکردبوو، پێشبینیی ئەوەم نەکردبوو، تێدەگەیت تۆ؟ چۆن دەکرێت من ئەوەندە کوێر بووبم؟ چۆن؟ یان ئەوەتا بە تەواوەتی کەر بووم یان بە تەواوەتی متمانەم پێ کردبوو. هەردووکیشی وەکوو یەکن، لە ڕاستیدا...

کورسییەکەم بۆ دواوە پاڵ نا.

- ئۆهـ پیێ... ژیان نوکتەیەکی چەند ناخۆشە...

- ئەمە چاکە، وا نییە؟
- زۆر. زۆر خراپە هیچ لە بەڵێنەکانی خۆی ناباتە سەر...
- ئەمە یەکەمجارم بوو بیخۆمەوە.
- منیش.
- وەکوو دارگوڵەباخەکەی تۆ وایە؛ لەبەر ناوەکەی کڕیم...
- مم. نوکتەیەکی ناخۆشە... چ کەرێتییەکە.
- بەس تۆ هێشتا گەنجیت...
- نا پیرم، هەست بە پیری دەکەم. من کەڵکم لێ بڕاوە. هەست دەکەم ئیتر گومان پەیدا دەکەم. ئیتر لە کونی دەرگاوە بە دزییەوە سەیری ژیانم دەکەم. دەرگا ناکەمەوە. "بچۆ دواوە. ئادەی با دەستت ببینم. باشە، ئادەی ئەوی ترت. خشەی پێت لەسەر عەرزەکە نەیەت. لە ڕاڕەوەکەدا بوەستە. مەجووڵێ."
- نا تۆ قەت وەک ئەو جۆرە ژنانەت لێ نایەت. هەرچەندیش بتەوێت، ناتوانیت. خەڵک بەردەوام دێنە ژیانتەوە، تۆ لە ئازارکێشان

بەردەوام دەبیت و ئاواش باشترە. من نیگەرانت نیم.

- نا، هەڵبەت کە نیت.
- مەبەستت چییە؟
- بێگومان تۆ نیگەرانی من نیت. تۆ بۆ کەس نیگەران نابیت، قەت...
- ئەوە ڕاستە، تۆ ڕاست دەکەیت. بۆ من زەحمەتە خەمی خەڵک بخۆم.
- بۆ؟
- نازانم. چونکە خەڵکی تر بۆ من مەسەلە نین، پێم وایە...

- ... جگە لە **ئەدریان**.
- مەبەستت چییە لە **ئەدریان**؟
- بیر لەو دەکەمەوە.
- نیگەرانی **ئەدریان**یت؟
- بەڵێ، پێم وا بێ... بەڵێ.

لە هەموو حاڵەتەکاندا، ئەو لە هەموان زیاتر مایەی نیگەرانیی منە.

- بۆ؟
- چونکە ئەو دڵی خۆش نییە.

منی بە تەواوەتی کێشایە دواوە.

- ئێ، ئێستا گوێم لە هەموو شتێک گرت! ئەو بە هیچ جۆرێک دڵخۆش نییە... بە پێچەوانەوە، زۆر دڵی تەنگە! ئەو ژنە بێزراو و بەکارهاتووەکەی گۆڕییەوە بە مۆدێلێکی تازەی خۆش. ئەو ئەمڕۆ ژیانی زۆر خۆشترە، دەزانیت.

سەیری مەچەکمم کرد.

- با بزانین، سەعات چەندە؟ چارەک بۆ دە. شەهیدەکەمان لە کوێیە ئێستا؟ دەبێت لە کوێ بێت؟ لە سینەما، یان ڕەنگە شانۆ؟ یان لە شوێنێک نانی ئێوارە دەخۆن. ئێستا دەبێت بەرکوڵەکەیان تەواو کردبێت... ئێستا دەستی کچەکەی گرتووە و دەست بە لەپیدا دەهێنێ و ماچی دەکات و بیر لە دوای ئەوە دەکاتەوە. وریا بە، ئەوە نانەکەیان هێنا، کچەکە دەستی دەکێشێتە دواوە و بزەیەکی بۆ دەکات. یان ڕەنگە ئێستا لە جێدا بن... ئەوەیان زۆر ڕێی تێ دەچێت، وا نییە؟ خەڵک لە سەرەتاکاندا زۆر

خۆشەویستی دەکەن، ئەگەر بە دروستی بیرم مابێت...

- ئەوە تۆ ڕەشبین بوویت لە مرۆڤ.
- من پارێزگاری لە خۆم دەکەم.
- ئەو خەریکی هەرچییەک بێت، بەختەوەر نییە.
- لەبەر من، مەبەستت؟ من خۆشییەکەم لێ تێک داوە؟ ئۆهـ ئەو ژنە بەهیچنەزانە...
- نەخێر. لەبەر تۆ نا، لەبەر خۆی. لەبەر ئەم ژیانە، کە هەرگیز ئەوەت بۆ ناکات کە تۆ دەتەوێت. هەرچیی هەوڵمانە شایستەی پێکەنینە...
- تۆ ڕاست دەکەیت، ئەو داماوە...
- تۆ گوێ لە من ناگریت.
- نەخێر.
- بۆچی گوێ لە من ناگریت؟

قەپم لە پارچەسەموونێک گرت.

- چونکە تۆ بلدۆزەریت، هەرچیی دێتە سەر ڕێت تەختی دەکەیت... بۆ تۆ، ئازاری من... چییە؟... کۆلێکە و بەم زووانە لێی بێزار دەبیت. ئینجا ئەم شتەی خوێنتێکەڵاوبوونە... ئەم بیروباوەڕە کەرانەیە... بۆ تۆ هیچ مەسەلە

نەبوو منداڵەکانی خۆت بگریتە باوەش، پێیان بڵێیت خۆشت دەوێن، تەنانەت بۆ یەکجاریش. بەس سەرەڕای ئەوەش، دەزانم تۆ هەمیشە خۆت هەڵدەدەی و پارێزگارییان لێ دەکەیت. بە چاوخشاندن لەوەی ئەوان چی بڵێن یان بکەن، هەمیشە لە بەرامبەر باقیی ئێمەی بەربەرییەکاندا جیاوازن- ئێمەی کە ناوی تۆمان هەڵنەگرتووە.

منداڵەکانت هیچ هۆیەکیان نەداوە بە تۆ بۆ بەختەوەری، بەس تۆ تەنیا کەسیت، کە دەتوانیت ڕەخنەیان لێ بگریت. تەنیا کەس! **ئەدریان** بۆ خۆی دەڕوات و من لێرە لەگەڵ کچەکاندا * جێ دەهێڵێت. باشە، ئەوە تۆ نارەحەت دەکات، بەڵام من دەستم لەوە شتووە گوێم لێت بێ چەند وشەیەکی زبر لە دژی بە کار بهێنیت. چەند وشەیەکی زبر... هیچ شتێک ناگۆڕێت، بەس تۆزێک من خۆشحاڵ دەکات. زۆرم خۆشحاڵ دەکات، هەر ئەگەر دەتزانی... بەڵێ، چارەسەری نییە. من چارەسەرم نییە. بەڵام هەر دوو وشە لە دڵەوە بێت، وشەی زۆر ڕەق، ئەوانەی تۆ زۆر باش دەزانیت چۆنیان بڵێیت... بۆچی بۆ ئەو نیتە؟ من شایستەی ئەوە هەم، دواجار. من چاوەڕێی

سەرزەنشتی ئەو پاتریارکەم لە سەری مێزەکەدا دانیشتووە. هەموو ئەم ساڵانە من گوێم لە تۆ ڕاگرتووە، جیهانت کردووە بە دوو بەشەوە. باش و خراپ، ئەوانەی ڕێزی تۆیان بە دەست هێناوە و ئەوانەی بە دەستیان نەهێناوە. هەموو ئەم ساڵانە من لەگەڵ گوتارەکانی تۆ، دەسەڵاتی تۆ، سیمای فەرمانڕەوای تۆ، بێدەنگیی تۆ... یەک دنیا لەخۆباییتیی تۆدا هەڵم کردووە. یەک دنیا لەخۆباییتی... لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام تۆ وەکوو ئازاری قوون وا بوویت، پیی...
چاوت لێیە من کەسێکی هێندە ئاڵۆز نیم و تەنیا پێویستم بەوە بوو گوێم لێ بێ بڵێیت، "کوڕەکەی من حەرامزادەیە و داوای لێبووردن لە تۆ دەکەم." من ئەوەم پێویستە، تێدەگەیت؟

- بە تەمای مەبە.

قاپەکانم پاک کردنەوە.

- بە تەمای نابم.

- حەز لە شیرینی دەکەیت؟
- نەء.
- هیچت ناوێت؟
- کەوابێ تێکم دا... دیارە تاڵەدەزوویەکی هەڵەم ڕاکێشا...

چیتر گوێم بۆ ڕانەگرتبوو.

- گرێکە بوو بە گرێکوێرە و ئەوەتا ئێمەش، لە هەموو کاتێک زیاتر لە یەک دوور کەوتینەوە. کەواتە من پیرەزۆڵێکم... دەعبایەکم... چی تریش؟

من بۆ ئیسفنجەکە دەگەڕام.

- چی تریش؟

ڕێک سەیری ناو چاویم کرد.

- گوێم لێ بگرە، پیێ؛ ساڵان لەگەڵ پیاوێکدا ژیام، کە نەیدەتوانی ڕاست بە پێوە بوەستێت چونکە باوکی بەو شێوەیە پشتی نەگرتبوو، کە ئەو پێویستی پێی بوو. کاتێک ئەدریانم ناسی، بوێریی ئەوەی نەبوو هیچ شتێک بکات، لە

ترسی ئەوەی نەبێتە مایەی نائومێدیی تۆ. هەرچیی شتێکیش کردی، منی نائومێد کرد، چونکە قەت لەبەر خاتری خۆی نەیکردن، بەڵکوو لەبەر تۆ بوون. بۆ ئەوەی سەری تۆ بسوورمێنێ، یان تۆ توورە بکات. کلک بە تۆوە بکات یان خۆشحاڵت بکات. مایەی بەزەییپێداهاتنەوە بوو. من تازە تەمەنم دەبووە بیست ساڵ و دەستم لە ژیانی خۆم هەڵگرت بۆ ئەو. بۆ ئەوەی کە دواجار دڵی خۆی کردەوە، گوێی لێ بگرم و ملی بشێلم. پەشیمان نیم لەوە، هیچی ترم بۆ نەدەکرا، بەهەرحاڵ. بێزار بووبووم لە بینینی کەسێک ئاوەها خۆی ڕسوا بکات. شەوگارێکمان بەوە بەسەر برد شت لێک بدەینەوە و هەڵیان بسەنگێنین. من ڕامدەتەکاند. هەزار جارم پێ دەگوت، کە ئەو ڕێگا ئاسانەکە هەڵدەبژێرێت بۆ خۆقوتارکردن. ئەو ڕێگا ئاسانەکە هەڵدەبژێرێت بۆ خۆقوتارکردن! بڕیارمان دەدا و دوایی جێبەجێمان نەدەکرد، بڕیاری ترمان دەدا و ئیتر من سەرەنجام وازم لە خوێندن هێنا، بۆ ئەوەی کە ئەو بتوانێت دووبارە خۆی هەڵسێنێتەوە. من قۆڵم لێ هەڵکرد و سێ دانە ساڵ ئەوم دەگەیاندە زانکۆکەی، ئینجا دەچووم

و کاتم لە ژێرزەمینەکەی لوڤێردا بە فیڕۆ دەدا. ئێمە وا ڕێک کەوتبووین: من سکاڵا نەکەم، بەو مەرجەی ئەویش باسی تۆ نەکات. من کەسێکی سەرئاسا نیم. قەت نەمگوتووە ئەو باشترینە. بەس من خۆشم دەویست. خۆشم دەویست. تۆ دەزانیت من باسی چی دەکەم؟

هیچی نەگوت.

- جا ئیتر تێ بگە من بۆچی ئەمڕۆ کەمێک دڵتەنگم...

ئیسفنجەکەم بە دەوری دەستیدا هێنا، کە لەسەر مێزەکە دانابوون.

- ئەو متمانەی بە خۆی بە دەست هێناوەتەوە؛ کوڕە یاخییەکە بووە بە پیاوێکی تر. دەتوانێت وەکوو پیاو کەشتیرانیی خۆی بکات و ئەوەتا کەسایەتییە کۆنەکەی لێرەدا ڕێک لەبەر لووتی باوکە زل و خراپەکەیدا فڕێ دەدات. تۆ دەبێت ددانی پێدا بنێیت، ئەوە تۆزێک قورسە؟

بێدەنگی.

هیچت بۆ گوتن نییە؟

نا. دەچم دەنووم.

قاپشۆرەکەم داگیرساند.

ئەوەش ئەو، شەو شاد.

لە ناوەوە، گازم لە ڕوومەتی خۆم گرت.

هەندێک شتی ترسناکم لە دڵی خۆمدا هێشتنەوە.

گڵاسەکەمم برد و چووم لەسەر قەنەفەکە دابنیشم. پێڵاوەکانم داکەندن و لەناو گۆشەکانی سەر قەنەفەکەدا خۆم نقووم کرد. هەستام بچم لەسەر مێزەکە بوتڵەکە بهێنم. لە ئاگرەکەمەوە ژەند، گڵۆپم کوژاندەوە و خۆم لەوێدا ناشت.

بە داخەوە بووم، کە هێشتا مەست نەبووبووم.

بە داخەوە بووم، کە لەوێدا بووم.

بە داخەوە بووم... بە داخەوە بووم بۆ زۆر شت.

زۆر شت...

سەرم نایە سەر دەسکی قەنەفەکە و چاوم داخست.

ئەو چوو گلاسێک شەراب بۆ خۆی تێ بکات و لەسەر تاکەقەنەفەکەی تەنیشت قەنەفە درێژەکەوە دانیشت.

هەر ڕەشەبای دەهات. ئێمە لە تاریکییەکەدا دانیشتبووین. سەیری ئاگرەکەمان دەکرد.

تاوناتاوێک، یەکێکمان قوومێکی لە خواردنەوەکەی دەدا و ئەوی تریشمان بە دوایدا.

نە دڵخۆش بووین و نە دڵتەنگ. ماندوو بووین.

دوای ساتێکی زۆر درێژ ئەو گوتی:

- دەزانیت، من ئەو کەسەم لێ دەرنەدەچوو کە تۆ گوتت، ئەگەر تۆزێک ئازاتر بوومایە...
- ببوورە؟

یەکسەر پەشیمان بووم لەوەی وەڵامیم دایەوە. نەمدەویست چیتر باسی ئەم گووە بکەین. هەر ئەوەندەم دەویست لێم گەڕێت ئارام بم.

- هەرچیی کەسە دایم باسی ئازاری ئەوانە دەکەن، کە جێهێڵراون، بەس ئەی تۆ قەت بیرت لە ئازاری ئەوانە کردووەتەوە کە دەڕۆن؟

*دەستمان پێ کردەوە*، لە دڵی خۆمدا گوتم، ئەوە ئێستا دەیەوێت چ بیرۆکەیەکی شێتانەم لەسەر بنێت، هەر کەرەکەی خۆمانە؟

سەیری ئەملاولام کرد بۆ پێڵاوەکانم.

- بەیانی قسەی لەسەر دەکەین، پیی، من دەچم... من تاقەتی ئەمەم نەما.
- ئازاری ئەو کەسانەی دەبنە هۆی دڵتەنگیمان... ئێمە بەزەییمان بەوانەدا دێتەوە، کە دەمێننەوە، ئارامیان دەکەینەوە، بەس سەبارەت بەوانەی دەڕۆن چی؟
- ئەوان چی تریشیان دەوێت؟

تەقیمەوە.

- مەدالیا؟ پشتگیری؟

ئەو گوێی لە من نەگرتبوو.

- ئازایەتیی ئەوانەی، کە بەیانییەک سەیری ئاوێنە دەکەن و بە خۆیان دەڵێن: "ئایا من مافی ئەوەم هەیە هەڵە بکەم؟" هەر ئەو چەند وشەیە... ئازایەتیی ئەوەی چاو بخەنە چاوی ژیانەوە و ببینن هیچ شتێکی جێگیر و هارمۆنیی تێدا نییە. ئازایەتیی ئەوەی هەموو شتێک وێران بکەن، وردوپردی بکەن لە... لە خۆپەرستییەوە؟ لە خۆپەرستییەکی پەتییەوە؟ نا، ئەوە نییە... ئەی چییە؟ هەستی بە زیندوویەتی مانەوەیە؟ ساتێکی ڕووناکبوونەوەیە؟ ترسی مردنە؟
ئازایەتیی ڕووبەڕووبوونەوەی خۆتە بۆ تەنیاجارێک لە ژیانتدا. خۆت، سەرەنجام، ڕووبەڕووی خۆت ببیتەوە.
"مافی ئەوەی هەڵە بکەیت"، دەربڕینێکی بچووکە، تەنیا دەستەواژەیەکی کورت و بچکۆلەیە، بەس ئایا کێ ئەو مافەت دەداتێ؟
کێ، ئەگەر خۆت بە خۆتی نەدەیت؟

دەستەکانی دەلەرزین.



- من هەرگیز ئەو مافەم بە خۆم نەداوە... هەرگیز هیچ مافێکم بە خۆم نەداوە. لە ئەرک بەدەر. ئینجا تەماشاکە من بووم بە چی: پیرەزۆڵێک. پیرەزۆڵێک لە چاوی یەک لەو چەند کەسە کەمە بەنرخانەدا، کە تۆزێک ڕێزیان لای من هەیە. چ شکستێکە...

زۆر کەسم لە خۆم کردووەتە دوژمن. من نە خۆم هەڵدەکێشم و نە گلەیی دەکەم. هەر بۆشم مەسەلە نییە. بەس هاوڕێکانم، ئەوانەی ویستوومە خۆشحاڵیان بکەم؟ زۆر کەمن، زۆر کەم... تۆش یەکێکیت لەوان. تۆ، **کلۆوی**، چونکە بەهرەیەکی وەهات بۆ ژیان تێدایە. بیگرە بە هەردوو دەستت. تۆ دەجووڵێی، سەما دەکەی، دەزانیت چۆن لە ماڵدا هەم باران بیت و هەمیش هەتاو. تۆ خاوەنی بەهرەیەکی وەهای بۆ دڵخۆشکردنی کەسانی دەوروبەرت، کە بە عەقڵدا ناچێت. تۆ زۆر بێسەرئێشەیت، زۆر بێسەرئێشەیت لەسەر ئەم هەسارە بچکۆلەیەدا...

- من وا هەست دەکەم من و تۆ باسی دوو کەسی جیاواز بکەین...

ئەو گوێی لە من نەبوو.

لەسەر کورسییەکەی خۆی قنج کردەوە. وازی لە قسەکردن هێنا. قاچی نەخستبووە سەر قاچ و گڵاسەکەی لە نێوان ڕانیدا دانابوو.

نەمدەتوانی دەموچاوی ببینم.

دەموچاوی لە سێبەری قەنەفەکەدا بوو.

- ژنێکم خۆش ویست... من باسی **سوزان** ناکەم، باسی ژنێکی تر دەکەم.

چاوم کردەوە.



- ئەوم لە هەرچیی شتە زیاتر خۆش ویست. لە هەرچیی شتە زیاتر... نەمدەزانی، کەس هەیە بتوانێت بەو ڕادەیە عاشق ببێت. یان خۆم، بە هیچ جۆرێک، پێم وا بوو کە من... بۆ ئەوە *پرۆگرام* نەکراوم ئاوەها عاشق ببم... ئاشکرابوونەکان، خەوزڕان، وێرانکارییەکانی عەشق، هەموو ئەوە بۆ خەڵکانی تر بوون. جگە لەوەش وشەی "عەشق" وای لێ دەکردم بە دزییەوە بزە بمگرێت. عەشق، عەشق! ئەوەم خستبووە شوێنێکەوە لە مابەینی "خەواندنی موگناتیسی" و "ئەفسانە"دا... بەو جۆرەی من دەمگوت لە چوار پیت زیاتر نەبوو. دواییش لە ساتێکدالە لێی دام، کە قەت چاوەڕێم نەدەکرد. من... من ژنێکم خۆش ویست.
وەک هەڵامەتگرتن عاشق بووم. بێ ئەوەی بمەوێت، بێ ئەوەی بڕوام پێی هەبێت، دژ بە خواستی خۆم و بێ ئەوەی بە هیچ جۆرێک بتوانم بەرگری لە خۆم بکەم، ئینجاش...

قوڕگی پاک کردەوە.

- لە دەستم دا... بە هەمان شێوە.

...

نەمدەتوانی بجووڵێم. ئەوە وەک سندانێکی ئاسن بە سەرمدا کەوت.

- ناوی **مەتیلدا** بوو. ئێستاش هەر ناوی مەتیلدایە، بەو بۆنەیەوە. **مەتیلدا کوبێت**. وەک نیگارکێشەکە...

تەمەنم چلودوو ساڵ بوو و پێم وا بوو من تازە پیر بووم. هەمیشە هەر پێم وا بووە پیرم. ئەوە **پۆل** بوو گەنج بوو. **پۆل** هەمیشە هەر گەنج و جوان دەبێت.

من **پیر**م. **پیر**ی زەحمەتکێش، **پیر**ی ئیشکەر. لە دەساڵیمدا، تەقریبەن هەر ئەم دەموچاوەم هەبوو کە ئەمڕۆ هەمە. هەمان قژبڕین، هەمان چاویلکە، هەمان قیافەت، هەمان وردەجووڵەی ماسوولکەکان. لە دەساڵیدا، فێر بووبووم قاپەکەم بۆ پەنیرخواردن بگۆڕم، وا بزانم...

لە تاریکییەکەدا، بزەیەکم بۆ کرد.

- چلودوو ساڵ تەمەن... دەبێت لە چلودووساڵیدا چی لە ژیان چاوەڕێ بکەیت؟

من، هیچ. چاوەڕێی هیچم نەدەکرد. کارم دەکرد، زیاتر و زیاتر و هەمیشە زیاتر. وەک خۆشاردنەوەیەک وەها بوو بۆ من، وەک قەڵغان و بەهانە. بەهانەی من بۆ ئەوەی ژیان نەکەم. چونکە زۆر حەزم لە ژیان نەبوو. پێم وا بوو من بەهرەی ژیانم نییە.

خۆم گرفتم بۆ خۆم دروست دەکرد، شاخ بۆ ئەوەی پێیدا هەڵگەڕێم. هیی زۆر بەرز بەرز، زۆر سەرەوژوو. ئینجا قۆڵم لێ هەڵدەماڵی، پێیاندا هەڵگدەڕام و ئینجا هیی ترم دروست دەکرد. بەوەشەوە من ئاواتی بەرزم نەبوو، هەر ئەوە بوو هیچ خەیاڵێکم نەبوو.

قوومێکی لە شەرابەکە دا.

- من... من هیچم نەدەزانی لەم بارەیەوە، دەزانیت... **مەتیلدا** فێری کردم. ئۆهـ **کلۆوی**... چەندم خۆش ویست... چەندم خۆش ویست... تۆ لەگەڵمدا ماویت؟
- بەڵێ.
- گوێت بۆ گرتووم؟
- بەڵێ.
- بێتاقەتم کردوویت؟
- نەخێر.
- بە نیازی خەوت لێ بکەوێت؟
- نەخێر.

هەستا و لقەدارێکی تری خستە سەر ئاگرەکە. لە بەردەم ئاگردانەکەدا چیچکەی کرد.

- دەزانیت ئەو سکاڵای لە چی دەکرد؟ ئەوەی کە من زۆر قسە دەکەم. تۆ بڕوا بەوە دەکەیت؟ من... زۆر قسە بکەم! بڕوای پێ ناکرێت، وا نییە؟ بەڵام ئەوە ڕاست بوو... سەرم دەخستە سەر سکی و قسەم دەکرد. چەندین سەعات

قسەم دەکرد، چەندین ڕۆژی تەواو، تەنانەت.
گوێم لە سەدای دەنگی خۆم دەبوو، لەژێر
پێستی ئەودا قووڵ دەبووەوە و ئەوەم خۆش
دەویست. بووبووم بە مەکینەی وشە... وام لێ
کردبوو سەری دەسووڕایەوە. کردبووم بە
ژێر وشەوە. پێدەکەنی. پێی گوتم، "*شششش،*
*ئەوەندە قسە مەکە*، ناتوانم چیتر گوێت لێ
بگرم. ئەوە بۆ وا درێژدادڕی دەکەیت؟"
چلودوو ساڵ بێدەنگیم هەبوو، قەرەبووی
بکەمەوە. چلودوو ساڵ قسەنەکردن،
خۆخواردنەوە. تۆ تۆزێک لەمەوپێش گوتت
چی؟ کە بێدەنگییەکەم لەوە دەچێت بە
سووکتان سەیر بکەم، وا نەبوو؟ ئەوە ئێشی
دێت، بەس دەتوانم تێبگەم، تێدەگەم بۆچی
خەڵک ڕەخنەم لێ دەگرن. بەس هیچ
ئارەزوویەکم نییە بەرگری لە خۆم بکەم.
ئەوەیە کێشەکە... بەڕاستی، بەڵام
بەسووکسەیرکردن، پێم وا نییە. هەرچەندە
سەیر ڕەنگە بێتە پێش چاو، بێدەنگیی من زیاتر
شەرمە. باییی ئەوەندە حەزم لە خۆم نییە هیچ
گرنگییەک لەوەدا ببینمەوە کە دەیڵێم. دووجار
بیر بکەرەوە، یەک جار قسە بکە، وەکوو پەندە
کۆنەکە دەڵێت. هەمیشە زۆری بیر لێ

بکەرەوە. خەڵک زۆر بە ساردم تێدەگەن... پێش **مەتیلدا** من حەزم لە خۆم نەبوو و لە دوای ئەوەشەوە زیاتر حەزم لە خۆم نەبووە. پێم وا بێت من کە ڕەقم لەبەر ئەوەیە...

هاتەوە دانیشت.

- من لەسەر کار توندوتیژم، بەس ئەوە لەبەر ئەوەیە من ڕۆڵێک دەگێڕم، دەبینیت؟ من دەبێت توندوتیژ بم، دەبێت وایان لێ بکەم وەک زۆردارێک بیرم لێ بکەنەوە. تۆ دەتوانی وێنای بکەیت ئەگەر نهێنییەکەمیان بۆ ئاشکرا ببێت؟ ئەگەر درک بەوە بکەن کە من شەرمنم؟ کە من دەبێت سێهێندەی ئەوانەی تر خۆم بڕەتێنم بۆ ئەوەی هەمان ئەنجامی ئەوان بە دەست بێنم؟ کە من زاکیرەم خراپە؟ کە من درەنگ لە شت تێدەگەم؟ ئەگەر ئەوە بزانن، هەر بە زیندوویەتی دەمخۆن!

هەروەها، من نازانم چۆن خۆم وا لێ بکەم خەڵک خۆشیان لێم بێت... هیچ کاریزمایەکم

نییە، وەکوو دەڵێن. ئەگەر بە کەسێکدا هەڵبڵێم، بە دەنگێکی وشک و ڕەق دەیڵێم؛ کاتێک کەسێک سوپاسم دەکات، وەڵام نادەمەوە. کاتێک دەمەوێت شتێکی جوان بۆ کەسێک بکەم، بەر بە خۆم دەگرم، ئەگەریش هەواڵێکی خۆشم پێ بێت ڕاییگەیەنم، **فرانسوازی** سکرتێرەم ڕادەسپێرم بیکات. کە دێتە سەر بەڕێوەبردن، یان سەرچاوە مرۆییەکان وەک دەڵێن، من کارەساتم، کارەساتێکی تەواوەتی.

**فرانسواز** بوو دژ بە ویستی خۆم، واژۆی جۆرە کۆرسێکی مەشقکردنی پێ کردم، بۆ سەرۆککارە بێفەڕەکان، چ بێماناییەک بوو... دوو ڕۆژ لە هوتێل کۆنکۆرد لافاییت لە پۆرت مایو دەم داخە، ئەمەریکییەکی دەروونناس و بەجۆشهاتوو قسەی پڕوپووچ بکات بە قوڕگتدا. لە کۆتاییدا کتێبەکەی خۆی فرۆشت. *کار و خۆشەویستی بکە و یەکەمین* بە ناوی کتێبەکە بوو. خوایە، چ ئەنتیکە بوو، کە ئێستا بیری لێ دەکەمەوە...

لە کۆتاییی کۆرسەکەدا، وەک بیرم بێت، دیپلۆمایان بە سەرۆککارە میهرەبان و فامیدەکان بەخشی. من دام بە **فرانسواز**، ئەویش لەو تاکەدا کە کەرەستەی پاککردنەوە

و دەسرِی تەوالێتی تێدا دادەنێن، بە دەرزی هەڵیواسی.
"چۆن بوو؟" **فرانسواز** لێی پرسیم.
"مایەی بەزەیی‌پێداهاتنەوە بوو."
ئەو بزەی کرد.
من پێم گوت، "گوێ بگرە، **فرانسواز**، تۆ وەک خوا وایت لەم شوێنەدا. هەرکەس پێی خۆشە پێی بڵێ، کە من کەسێکی باش نیم، بەڵام، کە ئەوان قەت کارەکانیان لە دەست نادەن، چونکە من زۆر باش حسابات دەکەم."
ئەو لەگەڵ دانەواندنی سەریدا، لەژێر لێوەوە گوتی "ئینشاڵا."
ئەوە ڕاستیش بوو. لە بیستوپێنج ساڵی زۆرداریمدا، نە ئەوان هەرگیز مانیان لێ گرتم و نە من کەسم لە کار دەرکرد. تەنانەت ئەو کاتەی لە سەرەتای نەوەتەکاندا بارودۆخەکان زۆر خراپ بوون، من هەرگیز یەک تاکەکەسم لە کار دەرنەکرد. یەک تاکەکەس، تۆ تێدەگەیت؟
- ئەی **سوزان**؟

ئەو بێدەنگ بوو.

- بۆ لەگەڵ ئەودا ئەوەندە ڕەقیت؟
- پێت وایە ڕەقم؟
- بەڵێ.
- لە چ ڕوویەکەوە ڕەقم؟
- ڕەقیت.

دووبارە سەری نایەوە سەر دەسکی قەنەفەکە.

- کاتێک **سوزان** پێی زانی، کە من ناپاک بووم لەگەڵیدا، ماوەیەکی زۆر بوو ئەوە تەواو بووبوو. من... ئەوەیانت دوایی بۆ باس دەکەم... لەو ساڵانەدا، لە شەقامی دی لا کۆنفۆنسیۆن دەژیاین. حەزم لە ئاپارتمانەکە نەبوو. حەزم لەو دیکۆرە نەبوو، کە ئەو بۆی کردبوو. دەیخنکاندم: زیاد لە پێویست کەلوپەل، زیاد لە پێویست خرتکەوپرتکە، زیاد لە پێویست وێنەی خۆمان، زیاد لە پێویست هەموو شتێک. من ئەمەت پێ دەڵێم، بەس گرنگ نییە. من بۆ خەوتن دەچوومەوە بۆ ئەو ئاپارتمانە و لەبەر ئەوەش کە خێزانەکەم لەوێدا دەژیان، نوختە. ئێوارەیەک داوای لێ کردم بۆ شێو بیبەمە دەرەوە. چووین بۆ

شوێنێک هەر لە خوار شەقامەکەی خۆمانەوە، دوکانێکی پیزای ناخۆش. گڵۆپە نیۆنەکان وایان کردبوو، ڕووخساری زۆر ناشرین بێتە پێش چاو، جا لەبەر ئەوەش ئەو سیمای ژنێکی هەتککراوی خستبووە سەر دەموچاوی، گڵۆپەکان یارمەتییان نەدابوو. ئەوە دڕندانە بوو، بەڵام من بە مەبەست نەمکردبوو، دەبینیت. هەر کە یەکەم شوێنی هەرزانم بینی دەرگایم کردەوە... دەمزانی چیم لە پێشدایە و حەزم نەدەکرد لە جێخەوەکەمەوە دوور بم. ئیتر وەکوو دەردەکەوێت، ئەو زۆری نەویست بۆ ئەوەی دەست پێ بکات. ئاشنامەکەی دانا و دانەنا و کەوتە گریان.

ئەو هەموو شتێکی دەزانی. ئەوەی کە ژنێکی گەنجتر بووە. دەیزانی چەندی خایاندووە و لەوە تێگەیشتبوو بۆچی ئێستا دایم لە ماڵ دوورم. ئەو ئیتر لە توانایدا نەمابوو. من دەعبایەکی دڕندە بووم ئیتر. ئایا ئەو شایستەی ئەو هەموو ئیهانەیە بوو؟ ئایا شایستەی ئەوە بوو بەم جۆرە مامەڵەی بکرێت؟ وەک کارەکەرێکی قاپشۆر؟ لە سەرەتادا، ئەو هەر ڕووی خۆی بە لاکەی تردا کردووە. ئەو گومانی لە شتێک پەیدا کردووە،

بەڵام متمانەی بە من هەبووە. لە دڵی خۆیدا گوتوویەتی ئەوە هەر شتێکی لەو شتانەیە، تەزووپێداهاتنێکە، پێویستیی خۆفریودانە، شتێکە پیاوەتیم ڕابگرێت. ئینجاش کارەکەم. کارەکەم هێندە ماندووکەرە، هێندە قورسە. ئەویش– ئەویش بە ڕێکسختنی ماڵە تازەکەوە سەرقاڵ بووە. نەیتوانیوە فریای هەموو شتەکان بکەوێت بە یەکەوە. نەیتوانیوە هەر ئاگرێک کەوتەوە ئەو بیکوژێنێتەوە. ئەو متمانەی بە من بووە! دواتر من نەخۆش کەوتبووم و ئەو هەر ڕووی خۆی بە لاکەی تردا کردووە. بەس ئێستا، ئێستا ئیتر لە توانایدا نەماوە. نا، چیتر لە توانایدا نەماوە. خۆویستیی من، ڕێزدانەنان بۆ ئەو، ئەو شێوازەی کە من– ڕێک لەو ساتەدا، گارسۆنەکە پێی بڕی و ئەویش لە نیوەچرکەیەکدا ماسکەکەی خۆی گۆڕی. بە خەندەیەکەوە، پرسیاری پاستای شتێک-یان- ئەوی تریانی لێ کرد. من سەرم سووڕ ما. کە گارسۆنەکە ڕووی کردە من، بە زمانێکی تێکەڵوپێکەڵ گوتم، "لەوەی... لەوەی مەدام." هەر بیریشم لە ئاشنامە نەفرەتییەکە نەکردبووەوە، دەبینی. بۆ یەک چرکەش...

لەو کاتەدا بوو کە زانیم **سوزان** چەندە بەهێزە. هێزێکی مەزنی هەیە. ئەو وەک باگردێنی هەڵم وەهایە. ئەو کاتە زانیم کە لە نێوان من و ئەودا، ئەو تۆکمەتر بوو و کە هیچ شتێک ناتوانێت بەڕاستی کار لەو بکات. لە ڕاستیدا، هەموو ئەمە لەبەر خشتە تایبەتییەکەی خۆی بوو. ئەو بە کار منی بردبوو، چونکە ئیتر خانووەکەی کەناردەریای تەواو بووبوو. دواهەمین وێنە هەڵواسرابوو، دواهەمین شیشی پەردە داکوترابوو و ئینجا ڕووی بە ئاراستەی مندا وەرگێڕابوو و تۆقیبوو لەوەی درکی پێ کردبوو.

من بە دەگمەن قسەیەکم کرد، بە ساردی بەرگریم لە خۆم کرد. وەک پێم گوتی، لەو کاتەدا من ئیتر **ماتیلدا**م لە دەست دابوو...

سەیری هاوسەرەکەمم کرد لەوبەری مێزەکەدا دڵی دەئێشا، لە دوکانێکی پیزای خەمگیندا لە بەشی پازدەیەمی پاریسدا و دەنگەکەیم کوژاندەوە.

بە دەست و دەموچاو قسەی دەکرد، فرمێسکی گەورە گەورە بەسەر ڕوومەتیدا دەهاتنە خوار، لووتی فنگ دەکرد و بە لەتێک سەموون قاپەکەی خۆی دەسڕییەوە. لە هەموو ئەو

کاتەدا من دوو یان سێ دانە سپاگێتیم لە چنگاڵەکەمەوە لوول دا، بێ ئەوەی هیچ بتوانم بۆ دەمم بەرزی بکەمەوە. هەروەها زۆر حەزم دەکرد بگریم، بەس ڕێم بە خۆم گرت...

- بۆچی ڕێت بە خۆت گرت؟
- ئەوە مەسەلەی چۆنێتیی پەروەردەبوونم بوو، وا دەزانم... هێشتاش هەستم دەکرد زۆر لاوازم... نەمدەتوانی سەرکێشیی خۆبەدەستەوەدان بکەم. لەوێدا نا. لەو کاتەدا نا. لەگەڵ ئەودا نا. لەو شوێنە جەرگبڕەدا نا. من... چۆنی بڵێم... بەهەزارحاڵ خۆم پێکەوە ڕاگیر کردبوو.

دواتر ئەو پێی گوتم چووەتە لای پارێزەرێک بۆ ئەوەی پرۆسەی تەڵاق دەست پێ بکەین. لە پڕ گوێم شل کرد. پارێزەر؟ **سوزان** داوای تەڵاق دەکات؟ قەت وێنای ئەوەم نەکردبوو، کە شتەکان هێندە زۆر ڕۆیشتبن، کە ئەو هێندە ئازاری خواردبێت... ئەو چوو ژنێک ببینێت، براژنی یەکێک لە هاوڕێکانی. دوودڵ بووبوو، بەڵام لە ڕێی گەڕانەوەی بۆ ئێرە لە کۆتاییی حەفتەیەکدا، بڕیاری خۆی دا. لە ئۆتۆمبیلەکەدا کاتێک من یەکجاریش چییە قسەم لەگەڵدا نەکرد بۆ ئەوە نەبێت بزانم وردەی پێیە بۆ

ئەوەی باجی مۆتۆڕوەیەکە[١٢] بدەم، ئەو بڕیاری خۆی دابوو. ئەو جۆرە ڕۆڵێتێکی ڕووسیی ژنومێردایەتیی دروست کردبوو: ئەگەر **پێی** قسەم لەگەڵدا بکات، دەمێنمەوە؛ ئەگەر نەیکات، تەڵاقی لێ وەردەگرم.

من شپرزە بووم. قەت نەمزانیبوو ئەو لە جۆری قوماربازەکانە.

خۆی کۆ کردەوە و بە متمانەبەخۆبوونێکی زیاترەوە تەماشای کردم. هەڵبەت، دەیوست چی لە دڵیدایە بیڵێت. سەفەرەکانم، درێژتر و زۆرتر لە هەرکات، حەزنەکردنم لە ژیانی خێزانی، منداڵە وەلانراوەکانم، کارتی ئەو ڕاپۆرتانەی قەت واژۆم نەکردن. ئەو هەموو ساڵە لەدەستچووەی ئەو بە ڕێکخستنی هەموو شتەکانی دەوروبەری من بە سەری بردبوون. بۆ حاڵباشیی من، بۆ کۆمپانیاکە. ئەو کۆمپانیایەی هیی خێزانەکەی ئەو بوو، هیی ئەو بوو، بە ڕێکەوت، ئەو قوربانییانەی ئەو دابوونی. چۆن خزمەتی دایکە داماوەکەمی کردبوو تا تەواوبوونی. هەموو شتێک بەڕاستی، هەموو شتێک ئەو دەیویست بیڵێت،

---

[١٢] هێڵی خێرا.

زائیدەن هەموو شتێک کە پارێزەرەکان حەز دەکەن گوێیان لێ بێت بۆ ئەوەی نرخێک لەسەر کۆی وێرانکارییەکە دابنێن.
بەڵام بەوە من دووبارە هەستم کرد بوومەوە بە کەسەکەی جاران. ئێستا لە ناوچەیەکدا بووین، پێی ئاشنا بووین. ئەو چی دەویست؟ پارە؟ چەند؟ ئەگەر ئەو ژمارەیەکی پێ بگوتمایە، من دەفتەرچەکەکەم بۆ دەخستە سەر مێز.
بەس نا ئەو ژمارەکەمی پێ بوو، من وام دەزانی وا ئاسان لێی دێمە دەرێ؟ مایەی بەزەییپێداهاتنەوە بووم... دیسان لە بەینەکانی پڕکردنی دەمی لە شیرینیدا دەستی دەکردەوە بە گریان. من بۆ نەمدەتوانی لە هیچ تێبگەم؟ ژیان هەر مەسەلەی زۆرانبازیی هێز نەبوو. پارە ناتوانێت هەموو شتێک بکڕێ. یان هەموو شتێکت بۆ بگەڕێنێتەوە. ئایا بە نیاز بووم خۆم وا نیشان بدەم کە لە هیچ تێنەدەگەیشتم؟ من دڵم نەبوو؟ بەڕاستی مایەی بەزەیی بووم. مایەی بەزەیی...
"ئەی بۆ داوای تەڵاق ناکەیت؟" سەرەنجام دەرم پەڕاند، دیقم کردبوو. "هەرچیی بووە بە ملی من. هەموو شتێک. گوێت لێیە؟ تەنانەت

ئەوەش کە دایکم چەند خراپ بووە، خۆشحاڵ دەبم شتێکت بۆ واژۆ بکەم و پێزانینی خۆم دەربڕم ئەگەر تۆ بەوە دڵخۆش دەبیت، بەس تکایە پارێزەرم بۆ مەهێنە ناوەوە، لێت دەپاڕێمەوە. لە جیاتی ئەوە پێم بڵێ چەندت پارە دەوێت."

ڕێگەکەم بۆ کورت کردەوە.

ئەو سەری هەڵبڕی و چاوی خستە چاومەوە. ئەوە یەکەمجار بوو لە ماوەی چەند ساڵدا، کە ئەوەندەمان سەیری چاوی یەکتر کردبێت. من بۆ شتێکی تر لە دەموچاویدا گەڕام. گەنجێتیمان، ڕەنگە... زەمەنێک کە من ئەوم نەدەخستە گریان. زەمەنێک من هیچ ژنێکم نەدەخستە گریان و ئەسڵەن بیرۆکەی دانیشتن لەسەر مێزێک و وردکردنەوەی لایەنی خۆشەویستیی ژیانی کەسێک شتێکی وێنانەکراو بوو.

بەڵام لەوێدا هیچ شتێک نەبوو، سیمای کەمێک خەمگینی مێردێکی دۆڕاو نەبێت، کە خەریک بوو ددان بە تاوانەکەیدا بنێت. ئەو نەچووبووەوە پارێزەرەکە ببینێت، چونکە ئازایەتیی ئەوەی نەبووبوو. ئەو ژیانەکەی خۆی خۆش دەویست، ماڵەکەی، منداڵەکانی،

دوکانەکانی گەڕەکەکەی، شەرمی دەکرد ددانی
پێدا بنێ و لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە ڕاست بوو:
ئەو ئازایەتیی ئەوەی نەبوو من بە جێ بهێڵێت.
ئازایەتی.
دەمتوانی بە شوێن ژنان بکەوم، ئەگەر ئەوە
خۆشحاڵی کردبام، دەمتوانی پەیوەندی
دروست بکەم، ئەگەر ئەوە دڵنیایی پێ بدابام،
بەس ئەو- ئەو نەدەڕۆیشت. نەیدەویست
ئەوەی هەیبوو لە دەستی بدات. پێگەی
کۆمەڵایەتی، هاوڕێکانمان، پەیوەندییەکانمان،
هاوڕێی منداڵەکانمان. ئینجا خانووە تازەکەی،
کە هێشتا تەنانەت شەوێکیشمان تێدا بەسەر
نەبردبوو... ئەوە سەرکێشییەک بوو ئەو
نەیدەویست بیکات. دواجار، کەڵکی چییشی
دەبوو؟ پیاو هەبوون خیانەتیان لە ژنەکانیان
کردبوو... زۆر لەوانە، تەنانەت... ئەو دواجار
چیرۆکی خۆی گێڕایەوە و نائومێد بوو لە
کۆنی و سواوییەکەی. ئیتر شتەکان بەو جۆرە
بوون کە هەبوون. خەتاکە هیی ئەوەیە، کە بە
نێوانی ڕانەکانمانەوە هەڵواسراوە. ئەو ناچار
بوو بزە بکات و بەرگە بگرێت، لێ گەڕێت
زریانەکە تێپەڕێت. ئەو هەنگاوی یەکەمی
نابوو، بەس بیرۆکەی ئەوەی چیتر مسس پێیێ

دیپل نەبێت، ئازایەتیی لێ بڕیبوو. ئەوە بەو جۆرە بوو کە هەبوو و زۆریش جێی داخ بوو بۆ ئەو. بێ منداڵەکان، بێ من، ئەو شتێکی وەها نەبوو.

دەسڕەکەمم دایە. "قەیناکە،" ئەو گوتی و زۆری لە خۆی دەکرد بزە بکات. "قەیناکە... من هەر لەگەڵت دەمێنمەوە چونکە بیرۆکەیەکی باشترم بە خەیاڵدا نایەت. بۆ جارێک لە جاران، من باش خۆم ڕێک نەخستبوو. من، ئەوەی هەمیشە پێشبینیی هەموو شتێک دەکەم. من... زۆرم لەسەر شان بوو، پێم وا بێت." لەناو فرمێسکەکانییەوە بزەیەکی کرد.

من دەستم بە پشتدەستیدا کێشا. تەواو بووبوو. من لێرە بووم. لەگەڵ کەسی تردا نەبووم. هیچ کەس. تەواو بووبوو. تەواو بووبوو...

لەگەڵ قاوەخواردنەوەدا سەبارەت بە سمێڵی خاوەنشوێنەکە و ناشرینیی دیکۆرەکەی قسەمان کرد.

دوو کۆنەهاوڕێ سەرتاپای لەشیان جێبرینە. بەردێکی زلمان هەڵبڕی و یەکسەریش لێی گەڕاین بکەوێتەوە خوارەوە.

تەماشاکردنی ئەوەی لەژێریدا خشکەخشکی بوو زۆر جەرگبڕ بوو.

...

- ئەو شەوە لە تاریکیدا، بێ جووتبوون سوزانم کردە باوەش. لەوە زیاترم پێ نەدەکرا.
بۆ من ئەوە شەوێکی بێخەویی تر بوو. ددانپێدانانەکانی ئەو، لە جیاتی دڵنیاکردنەوەم، بووە مایەی لەرزینێکی سەرتاپایی. دەبێت ئەوە بڵێم، لەو کاتەدا من حاڵم زۆر خراپ بوو. خراپ، زۆر خراپ. بە هەموو شت هەڵدەچووم. خۆم لە دۆخی خەمۆکییەکی تەواوەتیدا بینییەوە: ئەو ژنەم لە دەست دا کە خۆشم دەویست و لەوە تێگەیشتم کە ئەو ژنەی تریشم ئازار دا. چ فلیمێک بوو... خۆشەویستی ژیانم لە دەست دا بۆ ئەوەی لەگەڵ ژنێکدا بمێنمەوە، کە هەرگیز جێی نەدەهێشتم، لەبەر خاتری دوکانی پەنیرفرۆشی و قەسابییەکەی. ئەوە مەحاڵ بوو. هەرچیی شتە وێران بوو. قەت لە ژیانمدا هێندە خەمبار نەبووم...
ئەو دەرمانانەی دەمخواردن هیچ شتێکیان بۆ ئاسانتر نەکردم، ئەوە بە دڵنیایی، بەس ئەگەر

یەک تۆز ئازایەتیم تێدا مابا، ئەو شەوە خۆم هەڵدەواسی.

سەری بە پشتدا خست تا چی لە گڵاسەکەیدا بوو هەڵیدا.

- بەڵام سوزان؟ ئەو دڵتەنگ نییە لەگەڵ تۆدا...
- ئۆهـ تۆ پێت وایە؟ چۆن دەتوانی شتی وا بڵێیت؟ ئەو گوتوویەتی دڵی خۆشە؟
- نا، بەو شێوەیە نا. ئەو نەیگوتووە، بەس تێی گەیاندووم... بەهەرحاڵ، ئەو لەو جۆرە ژنانە نییە بۆ یەک دەقەش بوەستێ و لە خۆی بپرسێ ئایا دڵی خۆشە یان نا...
- تۆ ڕاست دەکەیت، ئەو لەو جۆرە نییە... بەهێزییەکەی لەوەدایە، بەو بۆنەیەوە. دەزانیت، کە ئەو شەوە من هێندە خەمبار بووم، بە هۆی ئەوەوە بوو. کە دەبینم ئەو چی لێ دەرچوو... هێندە بۆرژوا، هێندە تەقلیدی... ئەگەر دەتبینی چ شەڕفرۆشێک بوو کاتێک من ناسیم... من دڵخۆش نیم بەوەی کردوومە، بەڕاستی، هیچ شتێک نییە مایەی شانازی بێت. من ئەوم خنکاند. هێزم لێ بڕی. ئەو بۆ من هەمیشە ئەو

کەسە بوو کە ئامادەیی هەبوو. لەبەر دەستدا. نزیک لە دەستەوە. لەوسەری تەلەفۆنەکەدا. لەگەڵ منداڵەکاندا. لە چێشتخانەکەدا. جۆرێک بوو لە ڤێستا[12]، کە ئەو پارەیەی خەرج دەکرد، کە من پەیدام دەکرد و جیهانە بچکۆلەکەمانی بە ئارامی و بێ گلەیی هەڵدەسووڕاند. من قەت لە سەری لووتی خۆم بەولاوەم نەڕوانیوە.

من کام لە نهێنییەکانی ئەوم زانی؟ هیچ. ئایا پرسیارم لە بارەی خۆیەوە لێ کرد، لە بارەی منداڵیی، بیرەوەرییەکانی، پەشیمانییەکانی، ماندوویەتییەکانی، پەیوەندییە جەستەییەکانمان، ئومێدە کاڵەوەبووەکانی، خەونەکانی؟ نا، هەرگیز. هیچ. بۆ من مەسەلە نەبوو.

- زۆری مەپەچنە دڵتەوە، پیێ. ناتوانیت هەموو خەتاکە بخەیتە سەر شانت. خۆبەرقامچیدان خۆشیی خۆی هەیە، بەس هێشتا... سەینت سباستیانێکی زۆر جێبڕوا نیت، دەزانی...

- حەزم لەوەیە، تۆ ناهێڵی هەروا بۆی دەرچم. تۆی ئەو کەسەی بە ڕێکی دەمهێڵیتەوە... لەبەر

---

[12] خوابانووی ئاگردان لە ئەفسانەی یۆنانیدا.

ئەوە پێم ناخۆشە لە دەستت بدەم. کە تۆ بڕۆیت کێ هەیە نیشانەم لێ بگرێتەوە؟

- ماوەماوە نانێکی نیوەڕۆ پێکەوە دەخۆین...
- پەیمان؟
- بەڵێ.
- تۆ وا دەڵێیت، بەس قەت نایکەیت، دەزانم...
- دەیکەین بە نەریت، یەکەم هەینیی مانگەکە، بۆ نموونە...
- بۆچی هەینی؟
- چونکە حەزم لە ژەمی چاکی ماسییە! تۆ دەمبەیت بۆ ڕیستۆرانە باشەکان، وایە؟
- باشترینیان!
- باشە، من ئێستا دڵنیا بوومەوە... بەس تا ماوەیەکی زۆر ئەوە نابێت...
- ماوەیەکی زۆر؟
- بەڵێ.
- چەندێک؟

هیچم نەگوت.

- باشە. جا کوا زوو بێت.

له لقەداریکمەوە ژەند.

- بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە لای **سوزان**... لایەنە بۆرژواکەی، وەک تۆ دەڵێیت. ئەوە هیچ پەیوەندیی بە تۆوە نەبووە و ئەوەش شتێکی باشە. هەندێک شت هەن، کە هەمووی هیی خۆین، بێ هیچ یارمەتییەکی تۆ. وەک ئەو بەرهەمە ئینگلیزییانەی کە وا لاف لێ دەدەن "لە لایەن فەخامەتی شاژنەوە بە فەرمی بڕوای پێ دراوە." **سوزان** خۆی بووە بەو کەسەی کە هەیە، بێ هیچ "بڕواپێدان"ێکی تۆ. تۆ دەتوانی ناڕەحەتی بکەیت، بەس ئەوەندەش بەهێز نیت! ئەو ڕۆتینی خاتوونە بەخشندەیەی ئەو هەیەتی، ڕاکردنی بە شوێن تەنزیلات و ڕیسیپیی[14] خواردندا، ئەو پێویستی بە تۆ نەبوو ئەو هەموو فلیمەی بۆ بسازێنیت. ئەوە سرووشتییە لەودا، وەک دەڵێن. ئەوە لە خوێنیدایە، ئەو لایەنە من دەیتەکێنم، *سەرنجی دەدەم، بڕیاری لێ دەدەم و دەیبەخشمەی ئەو.* ماندووکەرە؛ من ماندوو دەکات، بەهەرحاڵ—

---

[14] ڕێکاری خواردن ئامادەکردن، کە لە کتێب یان شتی تردا دەردەهێنرێت.

لەپاکەتتانی کردارە باشەکانی ئەو، خواش دەزانێت ئەو کرداری باشی زۆرن، وایە؟
- بەڵێ. خوا دەیزانێت... حەز دەکەیت شتێک بخۆیتەوە؟
- نا، سوپاس.
- تۆزێک چای گیایی، بەشکوو؟
- نا، نا. نامەوێت خەریکە هێواش هێواش مەست دەبم...
- مادەم وایە باشە، من با ئارام لێت گەڕێم.
- پێی؟
- بەڵێ.
- ناتوانم تێی پەڕێنم.
- چی تێ پەڕێنی؟
- ئەوەی ئێستا بۆت باس کردم.
- منیش ناتوانم.

- ئەی ئەدریان؟
- چییەتی؟
- پێی دەڵێیت؟
- چی پێ بڵێم؟
- ئێ... هەموو ئەوە...

- ئەدریان هات بۆ لام، بڕوا دەکەیت یان نا.
- کەی؟
- حەفتەی پێشوو، ئینجا... منیش ئەوەم بۆ باس نەکرد. یانی، باسی خۆمم بۆ نەکرد، بەس گوێم گرت...
- چی پێ گوتی؟
- ئەوەی پێم گوتی، ئەوەی خۆشم دەمزانی... ئەوەی کە ئەو بەختەوەر نییە، ئەوەی کە چیتر نازانێت ڕوو لە کوێ دەکات...
- هاتبوو نهێنییەکەی خۆی بە تۆ بڵێت؟!
- بەڵێ.

دیسان دەستم کردەوە بە گریان.

- ئەوەت بە لاوە سەیرە؟

سەرم ڕاوەشاند.

- هەست دەکەم ناپاکیم لەگەڵ کراوە. تەنانەت تۆش... تۆ... ڕقم لەوەیە. من قەت ئەوە بەرامبەری کەسێک ناکەم، من-
- هێمن بەرەوە. تۆ هەموو شتێک تێکەڵ دەکەیت. کێ باسی ناپاکیی کردووە؟ کوا خیانەتەکە؟ ئەو بێ ئەوەی پێشتر ئاگادارم بکاتەوە هاتبوو،

هەر کە بینیشم پێشنیاری ئەوەم کرد بچینە دەرێ. مۆبایلەکەم کوژاندەوە و چووینە خوارەوە بۆ گەراجی ئۆتۆمبیلەکە. هەر ئۆتۆمبیلم خستە کار، ئەو پێی گوتم، "من **کلاوی** جێ دەهێڵم." من ئارامیی خۆمم ڕاگرت. بۆ هەوای کراوە لێمان خوڕی. نەمدەویست پرسیار بکەم، چاوەڕێم کرد ئەو قسە بکات... هەمیشە ئەمە گرفتەکەیە کام دەزوو ڕاکێشیت... نەمدەویست لە شتەکاندا پەلە بکەم. نەمدەزانی چی بکەم. کەمێک شپرزە بووم، ئەگەر ڕاستیت دەوێت. چوومە سەر شەقامی لاڕێی بازنەییی پاریس و تەپڵەکی جگەرەکەم کردەوە.

- ئێ ئینجا؟

من گوتم.

- ئێ ئینجا هیچ. ئەو خێزاندارە، دوو منداڵی هەن. بیری لێ کردووەتەوە. بیری کردووەتەوە کە ئەوە–
- دەمت داخە، تکایە دەمت داخە... باقییەکەی دەزانم.

هەستام لوولەی دەسرە کاخەزەکە بهێنم.

- دەبێت تۆ شانازیی پێوە بکەیت، ها؟ کارێکی مەزنی کردووە، وایە؟ ئەوە پیاو بۆ تۆ! چ مەردایەتییەکە. چ تۆڵەسەندنەوەیەکی شیرینە— ئەو چاکی گرتووی لەوێدا! چ تۆڵەسەندنەوەیەکی شیرینە...
- ئەو تۆنی دەنگە بە کار مەهێنە.
- هەر تۆنێکم بوێت بە کاری دەهێنم، پێشت دەڵێم من چۆنی بیر لێ دەکەمەوە... تۆ تەنانەت لەویش بەدتری. تۆ، تۆ هەموو شتێکت وێران کرد. ئۆهـ بەڵێ، لەژێر ئەو هەڵسوکەوتە شەرەفمەندانەیەتەوە، هەموو شتێکت وێران کرد و تۆ ئەویش بە کار دەهێنیت، ئەو لەگەڵ ئەموئەو خەوتنەی ئەو بە کار دەهێنیت بۆ ئاسوودەکردنی خۆت. من پێم وایە ئەوە مایەی بەزەییپێداهاتنەوەیە. قێزم لێتان دەبێتەوە، لە هەردووکتان.
- تۆ قسەی بێمانا دەکەیت. ئەوە دەزانیت، وا نییە؟ ئەوە دەزانیت کە قسەی بێمانا دەکەیت؟

زۆر بە نەرمی قسەی لەگەڵدا کردم.

- ئەگەر مەسەلەکە هەر لەگەڵ ئەموئەو خەوتن بوایە، وەک تۆ دەڵێیت، من و تۆ لێرەدا نەدەبووین، خۆشت ئەوە دەزانیت...

**کلۆوی،** قسەم لەگەڵ بکە.

- من لەشفرۆشێکی شاهانەم... نا، بۆ یەکجار بەرپەرچم مەدەرەوە. زۆر دڵخۆشم دەکات تۆ بەرپەرچم نەدەیتەوە.
- دەتوانم ددان بە شتێکدا بنێم؟ ددانپێدانانێکی زۆر قورس؟
- فەرموو، بەم حاڵەوە منی تێدام...
- من پێم وایە، کە ئەوە شتێکی باشە.
- کە چی شتێکی باشە؟
- ئەوەی لە تۆ ڕووی داوە...
- ئەوەی بووم بە لەشفرۆشێکی شاهانە؟
- نا، ئەوەی **ئەدریان** ڕۆیشتووە. من پێم وایە تۆ شایستەی باشتری... باشتر لەم بەختەوەرییە بە زۆر سەپێنراوە... باشتر لەوەی نینۆکەکانت لە مێترۆدا ڕێک بکەیتەوە و لاپەڕەکانی دەفتەری یادداشتەکەت ئەمدیواودیو بکەیت، باشتر لە گەڕەکی فێرمین-گیدۆن، باشتر لەوەی ئەو دوانەتان لێتان دەرچووە. مایەی دڵداخورپانە، کە من ئەمەت پێ دەڵێم، وا نییە؟ جا چ کارێکیشی بەسەر منەوەیە، بەهەرحاڵ؟

مایەی دڵداخورپانە، بەس زۆر خراپ. من بە نیاز نیم خۆم وا دەربخەم ئەو دوانەتان زۆر بۆ من گرنگن. پێم وا نییە **ئەدریان** کلاسی تۆ بوو‌بێت. ئەو لەگەڵ تۆدا تۆزێک لە پلەی خۆی هاتبووە دەرێ. لای من ئاوایە...

دەزانم مایەی دڵداخورپانە، چونکە ئەو کوڕی منە و نەدەبوو بەو شێوەیە باسی بکەم. بەس ئیتر ئاوایە، من پیرەزۆڵێکم و ڕواڵەتم بە لاوە هیچ نییە. من ئەمەت بۆیە پێ دەڵێم، چونکە بڕوام پێتە. تۆ... تۆ بەڕاستی بە تەواوەتی خۆش نەویستراببوویت. ئەگەر تۆش وەک من ڕێک لەم ساتەدا ڕاشکاو بیت، بریندارانە ڕەفتار دەکەیت، بەڵام تۆش ڕێک هەمان بۆچوونت دەبێت.

- تۆ قسەی بێفەڕ دەکەیت.
- ئەوەتا تۆش. ئەو تۆزە بیروڕادەربڕینەت لە تووڕەییەوەیە...
- ئێ ئێستا تۆ بوویت بە دەروونشیکار؟
- تۆ قەت گوێت لەو دەنگە کزەی ناوەوەت نەبووە، کە جاربەجار تێتەوە دەژەنێت، بۆ ئەوەی بیرت بخاتەوە، کە تۆ بەڕاستی بە تەواوەتی خۆش نەویستراویت؟
- نەء.

- نەء؟
- نەء.
- باشە. وا بزانم من هەڵەم...

خۆی کێشایە پێشەوە، ئەژنۆکانی فشار دا.

- وا بزانم تۆ دەبێت ڕۆژێک لەوێ بێیتە دەرەوە؟
- لە کوێ بێمە دەرەوە؟
- لەو ژێرزەمینە.
- تۆ بەڕاستی لەسەر هەموو شتێک خاوەنی بۆچوونیت، وا نییە؟
- نا، لەسەر هەموو شت نا. بۆچی خۆتت لەژێرزەمینی مۆزەخانەیەکدا کۆیلە کردووە، لە کاتێکدا دەزانیت چی لە توانای تۆدا هەیە؟ ئەوە کاتبەفیڕۆدانە. تۆ چی دەکەیت؟ کۆپی دەگریتەوە؟ گەچ دەگریتەوە؟ هەر خنەت دێت. کێ بایەخ بەوە دەدات؟ ئەی تا کەی تۆ ئەوە دەکەیت؟ تا خانەنشین دەبیت؟ پێشم مەڵێ تۆ لەو کونە جەهەندەمییە بە کارمەند ئاخنراوەدا بەختەوەریت...

بە گاڵتەجاڕییەوە گوتم:

- نا، نا، قەت وا نالّێم، دڵت ڕاحەت بێ.
- ئەگەر من خۆشەویستی تۆ بوومایە، پشتەملم دەگرتی و ڕامدەکێشایتەوە بەر ڕووناکییەکە. تۆ دەستەکانت بەهرەیەکی زۆریان هەیە و خۆشت ئەوە دەزانیت. قبووڵی بکە. بەهرەکانت قبووڵ بکە. بەرپرسیارێتییەکە بخە سەر شانت. لە شوێنێک دامدەنیشاندی و پێم دەگوتیت، "ئیتر بە کەیفی خۆت. سەرەیاریتە، **کلۆوی**. ئەسڵی خۆتمان پیشان دە."
- ئەی ئەگەر هیچم لە هەگبەدا نەبوو؟
- ئێ، ئەو ساتە ئیتر دەزانین. بەس لێوت بگەزە، ئازارم دەدات.
- بۆچی تۆ ئەوەندە بیرۆکەی باشت بۆ خەڵک هەیە و بۆ خۆت نا؟
- وەڵامی ئەو پرسیارەم داویتەوە.

- چییە؟
- وا بزانم گوێم لە ماریانە دەگری.
- من گ-
- ششش.
- قەیناکە، خەوی لێ کەوتەوە.

پاڵم دایەوە و بەتانییەکەم بەسەر خۆمدا ڕاکێشا.

- بچم تەماشایەک بکەم؟
- نا، نا. با تۆزێک بوەستین.

- ئینجا تۆ پێت وایە من شایستەی چیم، مستەر سەر-لە-هەمووشت-دەرچوو؟
- تۆ شایستەی ئەوەی چۆنیت وەها مامەڵە بکرێیت؟
- کە ئەویش...؟
- وەک شازادە. شازادەیەکی مۆدێرن.
- پففف... چ بێتامە.
- بەڵێ، من ئامادەم هەرچییەک بێت بیڵێم. هەرچییەک، تۆ بزەی پێ بکەیت... بزەم بۆ بکە، **کلۆوی**.
- تۆ شێتی.

هەستایە پێ.

- ئاهـ.. ئەوە پێرفێکتە! ئەوەم پێ خۆشترە. خەریکە کەمتر شتی کەرانە دەڵێیت... بەڵێ، من شێتم و دەزانی دەڵێم چی؟ من شێتم و من برسییشمە. چی شیرینیمان هەیە بیخۆم؟
- سەیری سەلاجەکە بکە. ماستی بەرماوەی کچەکان بخۆ...
- کوا؟
- لەژێرەوەیە.
- ئەو شتە بچکۆلە پەمەییانە؟
- بەڵێ.

- زۆر خراپیش نییە...

کەوچکەکەی لێسایەوە.

- دەزانیت ئەمە ناوی چییە؟
- نەء.
- تەماشا، تایبەت بۆ تۆ.

*ساختەچییە بچکۆلەکان*... ناسکە.

- ڕەنگە وا باش بێت بخەوین، وا نییە؟
- با.
- خەوت دێ؟

دڵم تەنگ بوو.

- پێت وایە چۆن بتوانم بنووم دوای ئەوەی ئەو هەموو شتە شڵەقێنراوە؟ وا هەست دەکەم حەوجۆشێکی زل تێک هەڵدەدەم...
- من گرێ دەکەمەوە و تۆ حەوجۆشەکەت تێک هەڵدە. سەیرە، ئەو وێنانەی ئێمە بە کاریان دەهێنین...
- تۆ زانای ماتماتیک و من پیرەژنە پووکاوەکەم.
- تۆ بەلای، وا نییە؟
- با، زۆر.
- بۆ؟
- نازانم. ڕەنگە لەبەر ئەوەی قسەی دڵ و زمانم یەکێکە. ئەوە زۆر ئاسایی نییە... من چیتر لەوە ناترسم خەڵک خۆشی لێم نەیەت.
- ئەی سەبارەت بە من؟
- ئۆهـ تۆ! تۆ خۆشت لێم دێت، من خەمی ئەوەم نییە!

بێن؟

- بەڵێ.
- چی بەسەر هات لەگەڵ مەتیلدا؟

سەیری منی کرد. دەمی کردەوە و دووبارە دایخستەوە. قاچی نایە سەر قاچ و داینایەوە. هەستایە پێ. ژەندییە ئاگرەکە و پشکۆکانی تێک هەڵدان. سەری دانەواند و لەژێر لێوەوە گوتی:

- هیچ. هیچ ڕووی نەدا. یان زۆر نەبوو. چەند ڕۆژێکی هێند کەم، چەند سەعاتێکی هێند کەم بوو... دەتوانیت بڵێی هیچ، بەڕاستی.
- ناتەوێت قسەی لە بارەوە بکەیت؟
- نازانم.
- تۆ قەت ئەوت نەبینییەوە؟
- با، یەکجار. چەند ساڵێک لەمەوبەر. لە باخەکەی پالەی ڕۆیال...
- ئێ؟
- ئێ هیچ.
- تۆ چۆنت ئەو ناسی؟
- دەزانی... ئەگەر دەست پێ بکەم، نازانم کەی دەوەستمەوە.
- پێم گوتیت خەوم نایەت.

ئەو کەوتە وردبوونەوە لە نیگارەکەی پۆل. وشەکانی ئاسان بۆ نەدەهاتن.

- کەی بوو؟
- ئەوە... بۆ یەکەمجار من ئەوم لە ٨ی جوونی ١٩٧٨دا ناسی، لە هۆنگ کۆنگ، لە سەعات دەوروبەری یازدەدا، بە کاتی ناوچەیی. لە نهۆمی نۆزدەهەمی هۆتێل هاییتدا یەکترمان بینی، لە ئۆفیسەکەی مستەر سینگدا، کە دەیویست لە شوێنێکی تایوان بیر هەڵکەنم. تۆ ئەمەت پێ سەیرە؟
- بەڵێ، چونکە زۆر بە وردەکارییەوەیە. ئەو لەگەڵ تۆدا کاری دەکرد؟
- ئەو وەرگێڕی من بوو.
- لە چینییەوە؟
- نا، لە ئینگلیزییەوە.
- بەس تۆ ئینگلیزی دەزانیت، وا نییە؟

- به باشی نا. ئەوەندە باشی نازانم ئەم جۆرە شتانەی پێ ڕایی بکەم؛ ئەوە زۆر ئاڵۆز بوو. کە دەگەیتە ئاستێکی ئاوەها، چیتر مەسەلەکە هەر زمان نییە، وەک فێڵی سیحریی لێ دێت. ئاماژەیەکت لە دەست دەردەچێت و ئیتر حسابت دەڕوات. سەرەڕای ئەوەش، تێرمە دروستەکانم نەدەزانی ئەو زمانە تەکنیکییەی پێ وەربگێڕم، کە ئەو کاتە بە کارمان دەهێنا. لەسەر ئەوانەشەوە، قەت من بە شێوەزاری چینییەکان ڕانایەم. وا هەست دەکەم لە کۆتاییی هەموو وشەیەکدا گوێم لە "تینگ تینگ" دەبێت. ئەوە باسی ئەو وشانەش هەر مەکە، کە من ئەسڵەن تێیان ناگەم.
- ئێ کەواتە؟
- ئێ کەواتە من سەرم لێ شێوابوو. چاوەڕێی ئەوە بووم لەگەڵ کابرایەکی ئینگلیزی پیردا کار بکەم، وەرگێڕێکی ئەو ناوە، کە **فرانسواز** بە تەلەفۆن پێیدا هەڵگوت، "دەیبینیت، جێنتڵمانێکی ڕاستەقینەیە..."

شتی وا نەبوو! من ئەوەتام لەوێدا، لەژێر فشاردا، چەند سەعات لە فڕۆکەدا بووم لەوپەڕی دنیاوە کات و شوێنم لێ گۆڕاوە، بە مەراقەوە، گرێم خواردووە، وەکوو گەڵا

دەلەرزم و کابرای ئینگلیز دیار نییە. ئەوەش ڕێکەوتنێکی بازرگانیی گەورە بوو، بابیی ئەوەندەی دوو ساڵ بزنسەکەی پێ بە ڕێوە بچێت. نازانم ئەگەر تۆ بتوانیت تێبگەیت.

- تۆ چیت دەفرۆشت؟
- تانکیی عەمارکردن.
- تانکیی عەمارکردن؟
- بەڵێ، بەس بوەستە. ئەمانە هەر تانکیی عەمارکردنی ئاسایی نەبوون، ئەمانە-
- نا، نا، گرنگ نییە! بەردەوام بە!
- جا، وەک گوتم، بێحاڵ بووم. چەند مانگ بوو کارم لەسەر ئەم پرۆژەیە کردبوو و بڕێکی زۆرم پارە تێ خستبوو. کۆمپانیاکەم خستبووە قەرزەوە و تەنانەت پاشەکەوتی تایبەتی خۆشمم خستبووە کارەکەوە. بەم ڕێکەوتنە بازرگانییە دەمتوانی داخستنی کارگەیەک لە نزیک **نانسی** دوا بخەم. هەژدە کارمەند. براکانی **سوزان** سوار کۆڵم بووبوون؛ دەمزانی دەیانویست تۆڵە بکەنەوە و هەروا لێم نەدەگەڕان، ئەو بێفەڕانە- سەرباری ئەوەش، تووشی سکچونێکی پیس بووبووم. ببوورە لە بازاڕپیبوونم، بەڵام... بەهەرحاڵ، چووم بۆ ئەو ئۆفیسە وەک ئەوەی بۆ شەڕ بچم و کە

لەوەش تێگەیشتم من ژیانی خۆم دەخەمە دەستی... دەستی... ئەم مەخلووقەوە، تەقریبەن بوورامەوە.

- بەس بۆ؟
- بزنسی نەوت، دنیایەکی زۆر پیاوانەیە، دەبینیت. ئێستا تۆزێک گۆڕاوە، بەس ئەو کاتە، زۆرت ژن تێدا نەدەبینی.
- تۆش...
- من چی؟
- تۆش خۆت تۆزێک پیاوانەیت.

نەیگوت نا.

- ڕاوەستە. بۆ ساتێک خۆت بخەرە شوێنی من. چاوەڕێ بووم کابرایەکی ئینگلیزی پیری بەڵغەماوی بەخێرهاتنم بکات، یەکێک بە سمێڵێک و قاتێکی چرچولۆچەوە، کە شارەزاییەکی چاکی هەبێت لە شێوازە کۆلۆنیالییەکانی کارکردندا، کەچی ئەوەتا من تەوقەم لەگەڵ ژنێکی گەنجدا دەکرد و نیگای لابەلام دەگرتە سەر سنگی... نا، بڕوام پێ بکە، ئەوە زۆر بوو. من پێویستم بەوە نەبوو...

هەستم کرد زەوی لەژێر پێمدا دەخزێت. ئەو ڕوونی کردەوە کە مستەر **ماگوو** نەخۆشە و دوێنێ ئێوارە ناردوویانە بە شوێن ئەمدا و ئینجا دەستمی زۆر بە قایمی گوشی بۆ ئەوەی هێزم بداتێ. بەهەرحاڵ، ئەو دوایی ئەوەی پێ گوتم: کە منی ڕاوەشاندووە تاکوو ددانەکانم بە چۆقە کەوتوون، چونکە پێی وا بووە من تا ڕادەیەک ڕەنگم سپی بووە.

- بەڕاستی ناوی مستەر ماگوو بوو؟
- نا. ئەوە خۆم دروستم کرد.
- دوای ئەوە چی بوو؟
- چرپاندم بە گوێیدا: "بەس هیوادارم تۆ ئاگادار بیت... مەبەستم، لە داتا تەکنیکییەکە... زۆر تایبەتمەندە... نازانم ئەگەر ئاگاداریان کردبێت..." ئینجا ئەویش یەک بزەی نایابی بۆ کردم. ئەو جۆرە بزەیەی کەمتازۆر مانای ئەوەیە، "ششش... هەوڵ مەدە سەرم لێ بشێوێنیت، پیاوە ئازیزەکەم."

من وێران بووبووم.

خۆم کێشایە لای ملە جوان و باریکەکەیەوە. بۆنێکی خۆشی لێ دەهات. بۆنێکی سەرسووڕهێنەرانە خۆشی لێ دەهات... هەرچیی شتە لە مێشکمدا تێکەڵاو بووبوو.

کارەسات بوو. ئەو لەوبەری منەوە دانیشت، ڕێک لای ڕاستی پیاوێکی بزێوی چینییەوە، کە منی بە گون گرتبوو، ئەگەر لە دەربڕینەکەم ببووریت. ئەو چەنەی نابووە سەر پەنجە لێکئاڵێنراوەکانی و نیگای پڕ متمانەی تێ دەگرتم بۆ ئەوەی هێزم بداتێ. شتێکی دڕندانە لەو نیوە-بزە بچکۆلانەدا هەبوو؛ من گێژ بووبووم و ئاگام لەوە بوو. هەناسەم وەستا. قۆڵەکانم لەسەر سکم لێک هەڵپێچان بۆ ئەوەی ورگم بشارمەوە و نزام بۆ ئاسمان دەکرد. من لەژێر بەزەییی ئەودا بووم و لەوەدا بووم جوانترین سەعاتەکانی ژیانم بژیم.

- تۆ چیرۆک باش دەگێڕیتەوە...
- پێم ڕادەبوێریت.
- نا، نا! بە هیچ جۆرێک!
- با. تۆ پێم ڕادەبوێریت. دەوەستم ئیتر.
- نا، تکایە! بە هیچ جۆرێک وا نییە. ئەی دوای ئەوە چی ڕووی دا؟
- لە گوڕت خستم.
- ئیتر قسە ناکەم.

ئەو بێدەنگ بوو.

- ئێ دوایی؟
- ئێ دوایی چی؟
- ئێ دوایی چۆن ڕۆیشت لەگەڵ مستەر **سینگ**؟



- تۆ بزە گرتوویتی. بۆچی بزە گرتوویتی؟ پێم بڵێ!
- من بزە گرتوومی چونکە ئەوە بە عەقڵدا نەدەچوو... چونکە ئەو بە عەقڵدا نەدەچوو... چونکە سەرلەبەری بارودۆخەکە هیچی بە عەقڵدا نەدەچوو...
- بەس بزە بۆ خۆت بکە! بۆم باس بکە، پیی! بۆم باس بکە!
- ئێ... سەرەتا قوتوویەکی لە جانتاکەی دەرهێنا، قوتوویەکی بچکۆلەی پلاستیکی لەسەر چەرمی تیمساح دروستکراوی چاویلکە. زۆر بە خۆبەشتزانییەوە ئەوەی ئەنجام دا. ئینجا چاویلکەیەکی ناشرینی لەسەر لووتی هاوسەنگ کرد. دەزانی، ئەها ئەو چاویلکە ڕەقانەی چوارچێوەی ئاسنیی سپییان هەیە.

ئەو جۆرەی مامۆستا خانەنشینەکان لە چاوی دەکەن. ئینجا لەو دەقەیەوە دەموچاوی بە یەکدا دا. ئیتر بەو شێوەیە سەیری نەدەکردم. چاوی تێ بڕیم و وەستا دەرسەکەم لەبەر بڵێم.

من قسەم دەکرد، ئەو وەری دەگێڕا. من کەوتبوومە ژێر سیحری ئەوەوە، چونکە ئەو دەستی بە ڕستەکە دەکرد بەر لەوەی من ئەوەی خۆم تەواو بکەم. نازانم چۆنی ئەنجام دەدا؛ شاکار بوو. ئەو نزیکەی لە هەمان کاتدا گوێی دەگرت و قسەشی دەکرد. وەرگێڕانێکی هاوزەمان بوو. ئەوە سیحری بوو... بەڕاستی... سەرەتا، من هێواش قسەم دەکرد و ئینجا خێراتر و خێراتر. وا بزانم دەمویست تۆزێک شەقەشەقی پێ بخەم. ئەو چاوی بۆ نەترووکاند. بە پێچەوانەوە، ئەو خۆشی لەوە دەبینی ڕستەکانمی بەر لە خۆم تەواو دەکرد. وای لێ کردم هەست بکەم پێشبینیکردنی من چەندە ئاسان بوو...

ئینجا ئەو هەستا خشتەیەک لەسەر تەختەیەک وەربگێڕێت. من سوودخۆریم لە بارودۆخەکە کرد بۆ ئەوەی لە قاچەکانی بڕوانم. ئەو تۆزێک قەدیمی بوو، لەسەر مۆدە نەبوو، باوی

بەتەواوی بەسەر چووبوو. تەنوورەیەکی تاسەرئەژنۆی خانەخانەی لە بەردا بوو، سێتێکی بلووس و چاکەتی سەوزی تۆخ و-
ئێستا بە چی پێدەکەنیت؟

- چونکە وشەی "سێت"ت بە کار هێنا. ئەوە دەمخاتە پێکەنین.
- بە ڕاست، نازانم بۆچی ئەوەندە مایەی پێکەنینە! ئەی قابیلە بڵێم چی؟
- هیچ، هیچ...
- چ بەڵایەکی تۆ...
- قسە ناکەم ئیتر، قسە ناکەم ئیتر.
- تەنانەت سوخمەکەشی مۆدەی کۆن بوو. سنگی بەرز کردبوونەوە، وەکوو کچانی زەمانی گەنجیم. جوان بوون، زۆر زل نەبوون، کەمێک بڵاو بوون، قنج... بەرز. ئینجا سەرسامیش بووم بە سکی. سکێکی بچکۆلەی خڕۆڵە، خڕۆڵەییەکەی وەک سکی باڵندە وا بوو. سکێکی بچکۆلەی جوان، کە خانەکانی تەنوورەکەی کشاندبوو و کە من... من لەژێر دەستەکانی خۆمدا هەستم پێ دەکرد... هەوڵم دەدا تەماشایەکی خێرای پێیەکانی بکەم، کە بینیم ئەو پەستی بووە. لە قسەکردن وەستا. ڕەنگی بە تەواوی پەمەیی بووبوو. تەوێلی،

گۆناكانی، ملی پەمەیی هەڵگەڕابوون. پەمەیی وەک ڕۆبیانێکی بچکۆلە. بە شپرزەیی سەیری کردم.
لێم پرسی:
"چی بوو؟"
"تۆ... تێنەگەیشتی گوتی چی؟"
"ئم... نەء. چی گوت؟"
"تێنەگەیشتی یان گوێت لێ نەبوو؟"
"من... نازانم... گوێم لێ نەبوو، وا بزانم..."
چاوی لە عەرزەکە بڕی. تێدا مابوو. من وێنای خراپترین شتم دەکرد، کارەساتێک، هەڵەیەک، تێکوپێکچوونێکی گەورە... کاتێک ئەو قژی ڕێک دەکردەوە، من لە مێشکی خۆمدا دەستم کردبوو بە داخستنی بزنسەکە.
"چی بوو؟ کێشەیەک هەیە؟"
مستەر **سینگ** پێکەنی، شتێکی بەو گوت، کە من هەر تێنەگەیشتم. تەواو سەرم لێ شێوابوو. یەک شت تێنەگەیشتم. وەک کەرێکی تەواو دەهاتمە پێش چاو!
"بەس ئەو گوتی چی؟ پێم بڵێ گوتی چی!"
ئەو زمانی گیرا.
"کارەکە ناکرێت، ئەوەیە مەسەلەکە؟"
"نا، نا، پێم وا نییە..."

"ئەی کەواتە چییە؟"

"مستەر **سینگ** پرسیاری ئەوەی لا دروست بووە، داخۆ بیرۆکەیەکی باشە ئەمڕۆ ڕێکەوتنێکی وەها گرنگ تاووتوێ بکەین..."

"ئاخر بۆ؟ چ کێشەیەک هەیە؟"

ڕووم کردە ئەو بۆ ئەوەی دڵنیای بکەمەوە. کەرانە سەرم دەلەقاند و هەوڵی بزەی سەرکەوتوویی بزنسمانێکی فرەنسی متمانەبەخۆبووم دەدا. دەبێت بێتام هاتبێتمە پێش چاو... سەرۆککارە گەورەکەش هەر پێدەکەنی... ئەو هێندە دڵی بە خۆی خۆش بوو، کە تۆ چاویت بۆ نەدەبینرا.

"من هیچ شتێکی هەڵەم گوتووە؟"

"نەخێر."

"تۆ شتێکی هەڵەت گوتووە؟"

"من، هەڵبەت نا! کاری من ئەوەیە ئەو قسە هەڵوەشاوانەی تۆ دووبارە دەکەمەوە."

"ئەی چییە ئیتر؟"

هەستم بە عارەق دەکرد بەملاولامدا دەهاتە خوارەوە.

ئەو پێکەنی و باوەشێنی خۆی کرد. کەمێک شپرزە دیار بوو.

"مستەر **سینگ** دەڵێت تۆ مێشکت نەداوەتێ.

"بەس با، با مێشکم داوەتێ! زۆر چاک مێشکم داوەتێ!" تەنانەت بە ئینگلیزی گوتم، "*زۆرم مێشک داوەتێ!*". "*نا، نا،*" کابرا بە سەربادانەوە، بە ئینگلیزی وەڵامی دایەوە.

"مستەر **سینگ** دەڵێت تۆ مێشکت لە لای نییە، چونکە خەریکە عاشق دەبیت و مستەر **سینگ** نایەوێت لەگەڵ کابرایەکی فرەنسیدا بزنس بکات، کە خەریکە عاشق دەبێت. ئەو دەڵێ ئەوە مەترسیی زۆرە."

سەرەی من بوو قرمزی هەڵگەڕێم.

"نا، نا..." من دووبارە بە ئینگلیزی گوتمەوە، "*من عەیبم نییە، مەبەستم ئەوەیە، ئارامم... من... من...*" ئینگلیزی و فرەنسیم تێکەڵ کردبوو.

بە کچەکەم گوت:

"پێی بڵێ ئەوە ڕاست نییە. قەیناکە. هەموو شتێک باشە. ئەوەی پێ بڵێ... من ئۆکەیم. *بەڵێ، بەڵێ، من ئۆکەیم.*"

ئارامم لێ هەڵگیرابوو.

کچەکە بزەیەکی لەوانەی پێشووتری کرد.

"ئەوە ڕاست نییە؟"

ئەوە من خۆم لە چ گوویەک نا؟

"نا، یانی، با... ئۆهـ.. نا، یانی کێشەکە ئەوە نییە... مەبەستم، کێشەکە لەوەدا نییە... من...
*هیچ کێشە لە گۆڕێ نییە، من عەیبم نییە!*"
وا بزانم هەموویان گاڵتەیان پێ دەکردم. سەرۆککارە زلەکە، هاوکارەکانی و ئەم خاتوونە گەنجەش.
کچەش هەوڵی نەدا بۆم ئاسان بکاتەوە:
"ئەوە ڕاستە، یان ڕاست نییە؟"
دەڵەقۆڕ! ئاخر ئەمە کاتی بوو؟
"ڕاست نییە" درۆم کرد.
"ئۆهـ دەباشە! نیگەرانت کردبووم..."
دەڵەقۆڕ، دیسان لە دڵی خۆمدا گوتم.
تەختی عەرزی کردبووم.

- ئێ دوایی؟
- ئێ دوایی گەڕاینەوە سەر کارەکە. زۆر پرۆفیشناڵانە. وەک ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت. من لە عارەق هەڵکشابووم. وام هەست دەکرد کەسێک لە کارەبای دابم و بە دڵنیاییشەوە توانام لەبەر بڕابوو... چیتر سەیری کچەکەم نەکرد. نەمدەویست. خۆزگەم دەخواست ئەو ئەسڵەن بوونی لە دنیادا نەبوایە. نەمدەتوانی ئاوڕ بە لای ئەودا بدەمەوە. دەمویست عەرز

کون ببێ و ئەوی تێ بچێت و منیش لەگەڵیدا. تا زیاتریش خۆم لێ گێل دەکرد، زیاتر عاشقی دەبووم. ڕێک وەک ئەوە وا بوو، ماوەیەک پێش ئێستا پێم گوتی، وەک نەخۆشی. دەزانیت چۆنە: جارێک، دووجار دەپژمیت، دەلەرزیت و بوووووم. تازە زۆر درەنگە. ئەوەی بوو، بوو. ئەوەش هەمان شت بوو: من تووش بووم، من لێ بوومەوە. هیوام لێ بڕابوو و کە ئەو وشەکانی مستەر **سینگ**ی دووبارە دەکردەوە، من بە سەردا خۆم لە فایلەکانمدا نقووم دەکرد. دەبێت کچە کەیفی پێ کردبێت. ئەو میحنەتە نزیکەی سێ سەعات درێژەی کێشا... چییە ئەوە؟ سەرماتە؟

- تۆزێک، بەس کێشەم نییە، باشم... بەردەوام بە. دوای ئەوە چی ڕووی دا؟

خۆی کێشایە لای من تا یارمەتیم بدات بەتانییەکە ڕاکێشمە سەر خۆم.

- دوای ئەوە، هیچ. دوای ئەوە... پێم گوتی، تا ئەوێ ئەوە خۆشترین بەشی بوو... دوای ئەوە من... ئەوە... دواتر ڕووداوەکە خەمگینتر بوو.
- بەس یەکسەری نا؟

- نا، یەکسەری نا. هێشتا هەندێ کاتی خۆشی تێدا بوو... بەڵام هەموو ئەو ساتانەی دوای ئەو چاوپێکەوتنە پێکەوە بەسەرمان بردن، وەک ئەوە وا بوو دزیبێتم...
- لە کێت دزیبێت؟
- لە کێ؟ لە چی؟ بەس بمزانیایە...

دوای ئەوە، کاخەزەکانم کۆ کردنەوە و سەری پاندانەکەم نایەوە. هەستامە پێ. تەوقەم لەگەڵ ئەشکەنجەدەرەکانمدا کرد و ژوورەکەم جێ هێشت. لە ئەسانسێرەکەشدا، کە دەرگاکان داخران، بەڕاستی هەستم کرد بە کونێکدا ڕۆ چووم. شەکەت بووم، خاڵیی، سەرتاپام گوشرابوو و لەسەر لێواری گریان بووم. شپرزە بووم، پێم وا بێت... هێندە بەدبەخت بووم، هێندە تەنیا بووم... تەنیایی، سەرباری هەمووی. گەڕامەوە بۆ ژووری هوتێلەکەم، داوای ویسکییەکم کرد و بانیۆم ئامادە کرد. من تەنانەت ناوی ئەویشم نەدەزانی. هیچم لە بارەیەوە نەدەزانی. لیستێکم لەو شتانە دروست کرد کە دەمزانین: ئینگلیزییەکی زۆر چاک قسەی دەکرد. زیرەک بوو... زۆر زیرەک بوو... دەشێت زیرەکییەکەی زیاد لە پێویست بووبێت؟ من واقم وڕ مابوو لە شارەزایییە

تەکنیکی و زانستی و ستیلسازییەکەی. ئەو گەنمرەنگ بوو. زۆر جوان بوو. بالآی... با بزانین... نزیکەی پێنج پێ و چوار ئینج دەبوو. ئەو بە منی ڕابوارد. ئەڵقەی هاوسەرگیرییشی لە پەنجەدا نەبوو و وایشی نیشان دەدا سکە بچکۆلەکەی نازکترین بێت. ئەو... چی تر؟ لەگەڵ ساردبوونەوەی بانیۆکەمدا، کەوتمە لەدەستدانی هیواکانم.

ئەو ئێوارەیە، لەگەڵ هەندێ لە پیاوەکانی **کۆمیکس**دا چووم بۆ نانخواردن. هیچم نەخوارد. هاوڕا بووم لەگەڵ هەموو شتێکدا، بە بەڵێ یان نەخێر وەڵامم دەدایەوە، بێ ئەوەی بزانم چی دەڵێم. ئەو وەک خێو چووبووە گیانمەوە.

ئەو وەک خێو چووبووە گیانمەوە، تۆ تێدەگەیت؟

لەبەر ئاگرەکەدا ئەژنۆی دادا و لەسەرخۆ کورەدەمەکەی خستە کار.

- کە گەڕامەوە بۆ هوتێلەکە، لە پرسگەکە نامەیەکیان لەگەڵ کلیلەکەمدا دامێ. لە دەستخەتێکی بچکۆلەدا خوێندمەوە:

*ئەوە ڕاست نەبوو؟*

ئەو لە بارەکە دانیشتبوو، تەماشای دەکردم و بزەی دەکرد.

چووم بۆ لای، هێواش بە سنگی خۆمدا دەکێشا.

دڵە داماوەکەم وەستابوو و من هەوڵم دەدا بیخەمەوە کار.

دڵم زۆر خۆش بوو. ئەوم لە دەست نەدابوو. هێشتا.

زۆر دڵخۆش بووم و واقیشم وڕما، چونکە جلەکانی گۆڕیبوو. ئێستا کابۆیەکی شینی کۆنی لەبەردا بوو لەگەڵ تیشێرتێکی دەڵب.

"ئەوە جلەکانت گۆڕیوە؟"

"ئم... بەڵێ."

"بەس بۆچی؟"

" کە تۆ پێشتر بینیمت، بە جۆرێک خۆم گۆڕیبوو نەناسریمەوە. من کە لەگەڵ ئەو جۆرە چینییانە کار دەکەم، کە بە شێوازی کۆن بیر دەکەنەوە، ئاوا خۆم دەگۆڕم. تێگەیشتووم، کە ئەو خۆگۆڕینە کۆنباوە دڵخۆشیان دەکات، دڵنیاییان دەداتێ... نازانم... زیاتر هەست بە متمانە دەکەن... من وەکوو پوورەقەیرەیەک خۆم دەگۆڕم و ئیتر بێوەی دێمە پێش چاو."

"بەس تۆ لە پوورێکی قەیرە نەدەچوویت، دەتوانم دڵنیات بکەمەوە! تۆ... تۆ بێعەیب بوویت... تۆ... من... من...، حەیفێ-"
"کە جلەکانم گۆڕیوە؟"
"بەڵێ."
"تۆش حەز دەکەیت بێوەی بم؟"
ئەو بزەی کرد. من توامەوە.
"پێم وا نییە تۆ لەو تەنوورە کورتە خانەخانەیەتدا هیچ کەمتر جێی مەترسی بیت. بە هیچ جۆرێک پێم وا نییە. یەک تۆزیش."

داوای بیرەی چینیمان کرد. ئەو ناوی **مەتیلدا** بوو، تەمەنی سی ساڵ بوو و ئەگەرچی سەری منی سوورڕماند، بەس هەموو ئازایەتییەکە هیی خۆی نەبوو: باوکی و دوو براکەی بۆ **شێل** کاریان دەکرد. ئەو هەموو تێرمەکانی لەبەر بوو. لە هەرچیی وڵاتی نەوت-بەرهەمهێنی جیهانە ژیابوو، پەنجا مەکتەبی کردبوو، بە هەموو زمانەکانیش دەیزانی جنێو بدات. ئەو نەیدەتوانی ڕێک بڵێت لە کوێ دەژی. خاوەنی هیچ نەبوو، لە بیرەوەری بەولاوە. هاوڕێش. عاشقی کارەکەی خۆی بوو، وەرگێڕانی بیروباوەڕەکان و یاریکردن بە وشەکان. لەو

ساتەدا لە هۆنگ کۆنگ بووبوو، چونکە ئەو بۆ ئەوەی کار پەیدا بکات هەر ئەوەندەی لەسەر بوو دەستی بێنێ. ئەو عاشقی ئەو شارە بوو، کە تێیدا باڵەخانە هەوربڕەکان لە شەودا هەڵدەستنە پێ و کە تێیدا دەتوانی خرتکەگۆشتی هەرزان هەر چەند هەنگاوێک لە خوار شەقامەکەوە بخۆیت. ئەو عاشقی ئەو وزەیە بوو لەو شوێنەدا هەبوو. کە منداڵ بووبوو، چەند ساڵێک لە فرانس ژیابوو و جارجارەش بۆ بینینی پورزاکانی گەڕابووەوە بۆ ئەوێ. بە نیاز بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان خانوویەک لەوێ بکڕێت، چ جۆرە خانوویەک بێت و لە کوێ بێت کێشە نەبوو، هەر مانگا و ئاگردانی ببوایە. ئەو کە ئەوەی گوت پێکەنی، چونکە لە مانگا دەترسا! جگەرەی لە من دەبرد و هەموو پرسیارەکانمی وەڵام دەدایەوە بە هەڵخولاندنەوەی چاوەکانی لە سەرەتادا. ئەو چەند پرسیارێکی لە من کرد، بەس من خۆم لێ دزینەوە. دەمویست گوێ لەو بگرم، دەمویست گوێم لە سەدای دەنگی ئەو بێت، ئەو کەمە شێوەزارە، ئەو شێوازە ڕاڕایی و کۆنباوەی ئەو بۆ بیرکردنەوە لە شتەکان هەیبوو. هەموویم خستە ناو خۆمەوە.

دەمویست خۆم لەودا نوقم بکەم، لە دەموچاویدا. حەزم لە ملی کردبوو، لە دەستی، شێوەی نینۆکەکانی، نێوچەوانە کەمێک قۆقزەکەی، لووتە بچکۆلە جوانەکەی، خەتونیشانی جوانییەکەی، بازنە ڕەشەکانی ژێر چاوی، چاوە توند و تیژەکانی... من بە تەواوی عاشقی بووبووم. تۆ بزە گرتوویتی دیسان.

- ناتناسمەوە.
- هەر سەرماتە؟
- نا، باشم.
- ئەو سەری منی سوڕماندبوو... دەمویست زەوی بوەستێ، ئەو شەوە قەت تەواو نەبێت. نەمدەویست جێی بهێڵم. هەرگیزاوهەرگیز. دەمویست تا کۆتاییی دنیا هەر بەسەر ئەو کورسییەوە بتلیسێمەوە و گوێ لەو بگرم باسی ژیانی خۆی بکات. من مەحاڵم دەویست. بێ ئەوەی بزانم، تۆنی پەیوەندییەکەمانم دانابوو... کات بە ڕاگیراوی، ناواقیعییە، مەحاڵە دەستی پێوە بگریت، نەهێڵیت بڕوات. مەحاڵیشە تامی بکەیت. ئینجا ئەو هەستایە پێ. دەبوو بەیانی زوو لەسەر کار بێت، دیسان بۆ **سینگ** و هاوبەشەکانی. ئەو بەڕاستی خۆشی لەو چەقەڵە پیرە دەهات، بەس دەبوو کەمێکی بۆ

بخەوێت، چونکە کابرا ئاسان نەبوو! منیش لە هەمان کاتدا هەستامە پێ. دیسان دڵم سست بوو. دەترسام لە دەستی بدەم. کە ئەو چاکەتەکەی دەکردە بەری، من منگەمنگێکم کرد.

"ببوورە؟"

"ترسملدستبەم."

"چیت گوت؟"

"گوتم دەترسم لە دەستت بدەم."

ئەو بزەی کرد. هیچی نەگوت. بزەی کرد و کەمێک خۆی بە پاشوپێشدا خست، دەستی بە یەخەی چاکەتەکەیەوە گرتبوو. من ماچیم کرد. دەمی داخرابوو. بزەکەیم ماچ کرد. سەری ڕاوەشاند و نەرمەپاڵێکی پێوە نام.

دەشیا بە پشتدا بکەوم.

...

- هەر ئەوەندە بوو؟
- بەڵێ.
- ناتەوێ باقییەکەیم پێ بڵێیت، تەواو؟ ئەوی تری بۆ منداڵان نابێت؟

- نا به هیچ جۆرێک! به هیچ جۆرێک، ئازیزی من... ئەو ڕۆشت و من دانیشتمەوە. باقیی شەوەکەم بە زیندەخەو بردە سەر، یادداشتە بچکۆلەکەیم بەسەر ڕانمدا دەهێنا. هیچێکی زۆر ئێرۆتیکی نەبوو، دەبینی...
- ئۆها ئێ، بەهەرحاڵ... ڕانت بوو...
- ئازیزی من، تۆ چەند بێعەقڵیت.

من خەنیمەوە.

- بەس کەواتە بۆچی هاتبووەوە؟
- منیش ئەو شەوە ڕێک ئەو پرسیارەم لە خۆم دەکرد، ڕۆژی دواییش، ڕۆژی دوای ئەویش و هەموو ڕۆژەکانی تر هەتاکوو دووبارە بینیمەوە...
- دوای ئەوە کەی بینیتەوە؟
- دوای ئەوە بە دوو مانگ. ئێوارەیەکیان لە ناوەڕاستی ئۆگەستدا لە ئۆفیسەکەم نیشتەوە. من چاولەڕێی کەس نەبووم. کەمێک زووتر لە کاتی خۆی لە پشوو گەڕابوومەوە، بۆ ئەوەی تا شتەکان ئارام بوون کار بکەم. دەرگاکە کرایەوە و ئەو بوو. هەرئاوا هاتبوو. بە ڕێکەوت. تازەکی هاتبووە نۆرماندی و

چاوەڕێی تەلەفۆنی هاوڕێیەکی بوو تا بزانێت کەی دەگەڕێتەوە. لە ڕێبەرنامەی تەلەفۆندا بۆ ناونیشانەکەم گەڕابوو و ئاوا هاتبوو.
پاندانێکی هێنابووەوە من لەوپەڕی دنیا جێم هێشتبوو. کە لە بارەکە بووبووین، بیری چووبوو بمداتەوە. بەس ئەمجارە یەکسەر بیری کەوتەوە و ناو جانتاکەی بۆ دەگەڕا.
ئەو نەگۆڕابوو. یانی، من ئایدیالیزەم نەکردبوو، جا لێم پرسی:
"بەس... تۆ هەر بۆ ئەوە هاتووی؟ لەبەر پاندانێک؟"
"بەڵێ، بە دڵنیایی. جوانە ئەو پاندانە. گوتم ڕەنگە پێوەی وابەستە بیت."
بە بزەوە، پاندانەکەی بۆ درێژ کردم. **بیک. ئەی** بوو. جافێکی بیکی سوور.
نەمزانی چی بکەم. من... ئەو لە ئامێزی کردم و من باڵم شکا. هەموو دنیا بوو بە هی من.

بەناو پاریسدا دەست لەناو دەست پیاسەمان کرد. بە درێژایی سین، هەموو ڕێگەکە لە تۆکادیرۆوە تا ئیل دو لا سیت. ئێوارەیەکی شکۆدار بوو. هەوا گەرم بوو و ڕووناکییەکە نەرم. لەوە نەدەچوو خۆر هەرگیز ئاوا ببێت.

ئێمە وەکوو دوو گەڕیدە وا بووین، بێخەم، پڕ لە سەرسامی، چاکەتەکانمان بەسەر شانماندا شۆڕ بووبوونەوە و پەنجەکانمان لە یەک ئالابوون. من ڕۆڵی چاوساغی گەڕیدەکانم دەبینی. سالان بوو من ئاوا پیاسەم نەکردبوو. دووبارە شارەکەی خۆم دۆزییەوە. لە پلاس دوفین نانمان خوارد و ڕۆژەکانی دوای ئەوەمان لە ژووری هوتێلەکەی ئەودا بردەسەر. یەکەم ئێوارەم لە بیرە. تامی سوێری ئەو. دەبێت ڕێک پێش ئەوەی سواری قیتارەکە بووبێت حەمامی کردبێت. لە شەودا لەبەر تینوویەتی هەستام. من... ئەوە نایاب بوو.

ئەوە نایاب بوو و سەرتاپاش درۆیینە بوو. هیچ شتێک واقیعی نەبوو. ئەمە ژیان نەبوو. ئەمە پاریس نەبوو. ئەوە مانگی ئۆگەست بوو. من گەڕیدە نەبووم. من بێ‌ژن نەبووم. درۆم دەکرد. درۆم بۆ خۆم دەکرد، بۆ ئەو، بۆ خێزانەکەم. ئەو هەڵنەخڵەتابوو، کاتێکیش ئاهەنگەکە تەواو بوو، کاتێک وەختی تەلەفۆنکردنەکان و درۆکان هات، ئەو ڕۆشت.

لە دەروازەی سواربوونی قیتارەکەدا پێی گوتم:

"من هەوڵ دەدەم بێ تۆ بژیم. هیوادارم ڕێگایەک بۆ ئەوە بدۆزمەوە..."

من ئازایەتیی ئەوەم نەبوو ماچی بکەم.

ئەو ئێوارەیە لە **درەگستۆر** نانم خوارد. ئازارم دەکێشا. وەک ئەوەی بەشێک لە جەستەم نەمابێت، وەک ئەوەی کەسێک قۆڵێک یان قاچێکی لێ کردبێتمەوە، ئازارم دەکێشا. ئەوە هەستێک بوو بە عەقڵدا نەدەچوو. نەمدەزانی چیم بەسەر هاتووە. بیرمە دوو تارماییم لەسەر دەسرێکی کاخەز کێشا. ئەوەی لای چەپیان ئەو بوو لە ڕووی پێشەوە و ئەوەی لای ڕاستیش هەر ئەو بوو لە ڕووی دواوە. هەوڵم دا بە دروستی بیری جێی خەتونیشانە جوانەکانیم بکەوێتەوە و کە گارسۆنەکە هات و ئەو هەموو نوختە بچکۆلە بچکۆلەیەی بینی، پرسی داخۆ پزیشکی دەرزی-ئاژنینم. نەمدەزانی چیم بەسەر هاتووە، بەڵام دەمزانی شتێکی جددییە! بۆ چەند ڕۆژێک، من بووبوومەوە بە خۆم. هیچ لە خۆم کەمتر یا زیاتر نەبووم. کاتێک لەگەڵ ئەودا بووم، هەستی ئەوەم هەبوو من پیاوێکی باش بم...

هەر بەو سادەییە. نەمدەزانی دەتوانم پیاوێکی باش بم.
ئەم ژنەم خۆش ویست. ئەم مەتیلدایەم خۆش ویست. سەدای دەنگیم خۆش ویست، ڕۆحی، پێکەنینی، بڕوابەخۆبوونی، ئەو جۆرە بڕوابەچارەنووسبوونەی لەو کەسانەدا دەیبینیت کە دنیا گەڕاون. پێکەنینەکەیم خۆش دەویست، حەزلەزانینکردنەکەی، بڕبڕەی پشتی، سمتە کەمێک هەڵتۆقیوەکەی، بێدەنگییەکەی، ناسکییەکەی و... هەموو ئەوەی دەمێنێتەوە. هەموو شتێکی... هەموو شتێکی. نزام دەکرد، کە توانای نەبێت بێ من بژی. بیرم لە دەرەنجامی ئەو بەریەککەوتنەمان نەدەکردەوە. تازە زانیبووم، کە ئەگەر تۆ دڵت خۆش بێت، ژیان زۆر بەچێژتر دەبێت. چلودوو ساڵم پێ چوو تا ئەوە بزانم و هێندە بە شەوارە کەوتبووم، کە ناچار هەموو شتێک وێران بکەم، بەوەی چاو ببڕمە ئاسۆ. من کەوتبوومە هەوای خۆمەوە.

گڵاسەکانمانی پڕ کردەوە.

- لەو ساتە بە دواوە، من خۆم بە کارەوە ئالوودە کرد. زۆربەی کاتەکانم لە ئۆفیس بەسەر دەبرد. یەکەم کەس دەچووم و دواهەمین کەس دەڕۆشتمەوە. شەممانیش کارم دەکرد و دڵم دەتەقی تا یەکشەممە دەڕۆیشت. هەرچیی جۆری بیانوو بوو دامهێنا. سەرەنجام، گرێبەستەکەم لەگەڵ تایواندا سەری گرت و دەمتوانی ئازادانەتر مانۆڕ بکەم. سوودخۆریم لە بارودۆخەکە کرد، بۆ ئەوەی پرۆژەی زیاتر لەسەر یەک هەڵچنم، ئیتر کەم یان زۆر ماقووڵییەتیی تێدا بوایە. هەرهەمووشی، هەموو ئەو ڕۆژانەی شێتی، هەموو ئەو سەعاتانە لەبەر یەک هۆ بوون: چونکە هیوام دەخواست ئەو تەلەفونێک بکات.
لە جێیەکی ئەم ئەستێرەیەدا ژنێک هەبوو- ڕەنگە لەسەر سووچەکە، ڕەنگە لە دووریی دەهەزار کیلۆمەتر- و تەنیا شتێک کە گرنگ بوو ئەوە بوو، کە ئەو بتوانێت دەنگی بە من بگات.

من متمانەم بە خۆم بوو و پڕی وزە بووم. پێم وا بێت لەو کاتەدا تەواو لە ژیانمدا بەختەوەر

بووم، چونکە تەنانەت ئەگەر لەگەڵیشیدا نەبوایەم، دەمزانی ئەو بوونی هەیە. هەر ئەوە بۆ خۆی قابیلی بڕواپێکردن نەبوو.
چەند ڕۆژێک بەر لە کریسمس، تەلەفۆنی کرد. دەهات بۆ فرانس و پرسی ئەگەر بوارم بۆ نانی نیوەڕۆ هەبێت لە حەفتەی دواتردا. بڕیارمان دا لە هەمان ئەو باڕی شەرابفرۆشییە بچکۆلەیەدا یەکتر ببینین. هەرچەندە، هاوین تەواو بووبوو و کە ئەو دەستی بۆ دەستم هێنا، من خێرا دەستم کێشایە دواوە. "ئەوانە دەتناسن لێرە؟" ئەو پرسی، بزەکەی شاردبووەوە.
من ئازاریم دا. زۆر دڵتەنگ بووم. دەستم بردەوە بۆ دەستی، بەڵام ئەو نەیگرت ئیتر. ئاسمان تاریک بوو و ئێمە هێشتا بەر یەکتر نەکەوتبوون. هەمان ئەو ئێوارەیە لە ژووری هوتێلێکی تردا بینیم و کاتێک ئیتر دەمتوانی پەنجەکانم بەناو قژیدا بهێنم، ژیانم تێ گەڕایەوە.
من... من عاشقی خۆشەویستیکردن بووم لەگەڵیدا.
پاشنیوەڕۆی دوای ئەوە، لە هەمان شوێندا یەکترمان بینی و ڕۆژی دواتریش... ئینجا ئەوە

ڕۆژێک بەر لە ئێوارەی جەژنی کریسمس بوو، ئێمە لە یەک جیا دەبووینەوە. ویستم لێی بپرسم ئەو پلانی چییە، بەس لەوە نەدەچوو بتوانم دەمم بکەمەوە. دەترسام- شتێک لە ناوسکمدا هەبوو، نەیهێشت بزەی بۆ بکەم.

ئەو لەسەر سیسەمەکە دانیشتبوو. من لێی چوومە پێشەوە و سەرم خستە سەر ڕانی.

"ئێمە چیمان لێ دێت؟" ئەو پرسی.

من هیچم نەگوت.

"دوێنێ، کە تۆ لێرەدا، لەم ژووری هوتێلەدا، لە ناوەڕاستی پاشنیوەڕۆدا، جێت هێشتم، بە خۆمم گوت هەرگیز ناهێڵم جارێکی تر بەمەدا تێپەڕمەوە. هەرگیز جارێکی تر، گوێت لێیە؟ هەرگیز... خۆم گۆڕی و چوومە دەرەوە. نەمدەزانی بۆ کوێ بچم. نامەوێ جارێکی تر ئەمە دووبارە بکەمەوە؛ ناتوانم لە ژووری هوتێلێکدا لەگەڵت پاڵ بکەوم و ئینجا دواتریش تۆم لە دەرگاکەوە لێ بڕۆیت. ئەوە سەختییەکەی لە ئەندازە بەدەرە."

بە زەحمەت قسەکانی بۆ دەکرا.

"بەڵێنم بە خۆم دا، کە هەرگیز بەمەدا تێنەپەڕمەوە، لەگەڵ پیاوێکدا کە دەبێتە هۆی ئازارکێشانم. پێم وا نییە من شایستەی ئەوە

بم، تۆ تێدەگەیت؟ من شایستەی ئەوە نیم. جا بۆیە من لێت دەپرسم: ئێمە چیمان لێ دێت؟"

من هەر بێدەنگ بووم.

"تۆ هیچت بۆ گوتن نییە؟ دەمزانی. قابیلە چی بڵێیت، بەهەرحاڵ؟ قابیلە چی بکەیت؟ تۆ ژنومنداڵی خۆت هەیە. ئینجا من، من چیم؟ من هیچێکی وا نیم لە ژیانی تۆدا. لەو دووریی دوورە دەژیم... هێندە دوور و هێندەش نائاسایی... نازانم چۆن وەک خەڵکی بژیم. بێ خانوو، بێ ناوماڵ، بێ پشیلە، بێ کتێبی چێشتلێنان، بێ پلان. وام دەزانی من زۆرزانەکەم، کە لە خەڵکی باشتر لە ژیان گەیشتووم. شانازیم بە خۆمەوە دەکرد، کە نەکەوتوومەتە داوەکەوە. ئینجا تۆ هاتی و من هەست دەکەم کەوتوومەتە دەریاوە.

ئێستاش حەز دەکەم تۆزێک هێواشی بکەمەوە، چونکە تێگەیشتم کە ژیان لەگەڵ تۆدا سەرسوورهێنە. پێم گوتی هەوڵ دەدەم بەبێ تۆ بژیم... هەوڵم دا و هەوڵم دا، بەس من ئەوەندە بەهێز نیم؛ بەردەوام بیر لە تۆ دەکەمەوە. بۆیە من ئێستا و ڕەنگە بۆ دواجار بێت ئەوەت لێ دەپرسم: تۆ چ پلانێکت بۆ من هەیە؟"

"خۆشم دەوێیت."

"چی تریش؟"

"بەڵێنت پێ دەدەم، کە قەتاوقەت جارێکی تر لە ژووری هوتێلێکدا جێت نەهێڵم. بەڵێنت پێ دەدەم."

ئینجا وەرسووڕام و سەرم خستەوە نێوان ڕانەکانی. ئەو بە قژ بەرزی کردمەوە.

"ئەی چی تریش؟"

"خۆشم دەوێیت. من تەنیا ئەو کاتە دڵخۆشم کە لەگەڵ تۆدام. تەنیا تۆم خۆش دەوێت. من... من... متمانەم پێ بکە..."

دەستی لە سەرم بەردا و گفتوگۆکەمان لەوێدا تەواو بوو. من ئەوم بە نەرمی گرتبوو، بەڵام ئەو دەستی لە خۆی بەرنەدەدا، لێ گەڕا چۆن دەبێ ببێت. ئەوەش هەمان شت نییە.

- دوای ئەوە چی ڕووی دا؟
- دوای ئەوە ئێمە بۆ یەکەمجار لە یەک جیابووینەوە... دەڵێم "بۆ یەکەمجار" چونکە زۆر جاری تر لە یەک جیا بووینەوە... ئینجا من تەلەفۆنم بۆ کرد... لێی پاڕامەوە... بیانوویەکم دۆزییەوە بۆ ئەوەی بچمەوە بۆ چین. ژوورەکەیم بینی، ژنە خاوەنماڵەکەی...

حەفتەیەک مامەوە. ئەو کاتانەی ئەو لە کار بوو، من دەبووم بە بۆریچی و کارەباچی و بەنا. وەک شەیتان کارم دەکرد بۆ مس لی، کە کاتی خۆی بە گۆرانیگوتن و یاریکردن لەگەڵ باڵندەکانیدا دەبردە سەر. بردمی بۆ بەندەری هۆنگ کۆنگ و بردمی بۆ سەردانی خاتوونێکی ئینگلیزی پیر، کە پێی وا بوو من لۆرد ماونتباتنم! منیش وەها ڕەفتارم کرد، ئەگەر بتوانیت وێنای بکەیت!

دەتوانیت تێبگەیت هەموو ئەمە چی بۆ من دەگەیاند؟ بۆ ئەو کوڕە بچکۆلەیەی، کە قەت ئازایەتیی ئەوەی نەبوو سواری ئەسانسێر بێت بۆ نهۆمی شەشەم؟ تەواوی ژیانم لە نێوان دوو بەشی پاریس و خانوویەکی بچکۆلەی لادێدا بردبووە سەر. هەرگیز دایکوباوکمم بە بەختەوەری نەبینیبوون، تاقەبراکەم تا مردن خنکا، منیش یەکەم دنکی خۆمم هێنا، خوشکی یەکێک لە هاوڕێکانم بوو، چونکە نەمزانیبوو چۆن لە کاتی خۆیدا دەریبهێنمەوە...
ئیتر ئەوە بوو. ئەوە بوو ژیانی من.
دەتوانیت تێبگەیت؟ وام هەست دەکرد بۆ جاری دووەم لە دایک بووبمەوە، وەک ئەوەی

دووباره هەمووی دەستی پێ کردبێتەوە، لە ئامێزی ئەودا، لەو پەناگە گوماناوییەدا، لەو ژووره بچکۆله شێدارەی مس لیدا...

لە قسەکردن وەستا.

- ئەوە **کریستین** بوو؟
- نا، ئەوە پێش **کریستین** بوو... ئەو یەکەیان لەبار چوو.
- نەمزانیبوو.
- کەس نازانێت. چی لەوەدا هەیە بزانرێت؟ لەگەڵ کچێکی گەنجدا هاوسەرگیریم کرد، کە خۆشم دەویست، بەڵام بەو شێوازەی تۆ کچێکی گەنجت خۆش دەوێت. خۆشەویستییەکی ڕۆمانتیکیی پەتی؛ یەکەم لێشاوی هەست... ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکەمان ڕووداوێکی زۆر خەمگین بوو. ئەوە دووباره لە هەوەڵەوە وەک یەکەمین پەیوەندیی گیانی بەگیانیی من وەها بوو.

**سوزان**یش هەروەها وێنای ئەوەی نەکردبوو، کە شتەکان هێندە خێرا ڕوو بدەن. ئەو گەنجێتی و خەیاڵەکانی لە چاوترووکانێکدا لە

دەست دان. ئێمە هەردووکمان هەموو شتەکانمان لە دەست دان، لە کاتێکدا باوکی ئەو زاوایەکی پێرفێکتی بە دەست هێنا. من تازە لە قوتابخانەیەکی ئەندازیاریی پلەیەک دەرچووبووم و باوکی لەوە باشتری پێ وێنا نەدەکرا، لە کاتێکدا کورەکانی خۆی... *ئەدەبیات*یان دەخوێند. ئەو بە ئەستەم وشەکەی بۆ حونجە دەکرا.

من و **سوزان** شێتانە عاشقی یەک نەبووین، بەڵام بەڕەحم بووین بۆ یەکتری. ئەو کات، یەکمان خراپ بووینایە ئەوی ترمان باش دەبوو.

من ئەم هەمووەت بۆ دەگێڕمەوە، بەس بەڕاستی نازانم ئەگەر تۆ بتوانیت بە تەواوەتی تێبگەیت. شتەکان زۆر گۆڕان... ئەوە چل ساڵ پێش ئێستا بوو، کەچی لەوە دەچێت دوو سەدە بێت. ئەو زەمانە بوو، کچ ئەوکاتەی سووری مانگانەکەیان دوا دەکەوت شوویان دەکرد. ئەمە ڕەنگە وەک پێش-مێژوو بێتە پێش چاوی تۆ...

دەموچاوی هەنوو.

- ئێ، لە کوێدا بووم؟ ئۆهـ ئا... دەمگوت، کە خۆمم لەوپەڕی دنیا لەگەڵ ژنێکدا بینییەوە، کە بژێویی خۆی بە بازدان لەم قارە بۆ ئەو قارە دابین دەکرد و کە لەوەش دەچوو من چۆن بووم ئاوەها خۆشی بوێم، بەخاتری ئەوەی لە ناخمدا بوو. ژنێک، کە خۆشی دەویستم، پرکێشیی ئەوە دەکەم بڵێم... بە ناسکی. هەموو ئەمە زۆر زۆر تازە بوو. زۆر ناوازە. ژنێکی سەرسووڕهێن، کە هەناسەی خۆی گرتبوو، کاتێک تەماشای دەکردم شۆربای ماری کوبرا و گوڵەداوودیم دەخوارد.
- خۆش بوو؟
- تۆزێک جەلاتینی بوو بە دەمی من...

بزەی کرد.

- دواتریش کە سواری فڕۆکە بوومەوە، بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا نەدەترسام. بە خۆمم

گوت: با بتەقێتەوە، با لە ئاسمان بکەوێتە خوارەوە و بیدا بە زەویدا، کێشە نییە.

- بۆچی ئەوەت بە خۆت گوت؟
- بۆچی؟
- بەڵێ، بۆچی؟ من بوومایە ڕێک پێچەوانەکەیم دەگوت... بە خۆمم دەگوت: "ئێستا دەزانم بۆچی دەترسم، ئەم فڕۆکە نەفرەتییەش باشتر وایە بەرنەبێتەوە!"
- وایە، تۆ ڕاست دەکەیت. ئەوە عاقڵانەتر دەبوو... بەڵام ئیتر ئەوەتا، ئەمەش کرۆکی کێشەکەیە: من وام نەگوت. لەوانەیە تەنانەت هیواشم خواستبێت، کە فڕۆکەکە بیدا بە زەویدا... ئەوسا ژیانم زۆر سادەتر دەبوو...
- تۆ تازە ئەو ژنەت ناسیبوو کە لە ژیانتدا ویستبووت، کەچی بیرت لە مردن دەکردەوە؟
- من نەمگوت دەمویست بمرم!
- منیش وام نەگوت. گوتم بیرت لە مردن دەکردەوە...
- دەشێت من هەموو ڕۆژێک بیر لە مردن بکەمەوە، تۆ وا نیت؟
- نەء.

- پێت وایە ژیانت نرخێکی هەبێت؟
- ئاهـ.. بەڵێ... کەمێک، بەهەرحاڵ... لەبەر منداڵەکانیش...
- ئەوە هۆیەکی باشە.

لەسەر تاکەقەنەفەکە دانیشتبووەوە و دووبارە دەموچاوی شاردرابووەوە.

- وایە، هاوڕام لەگەڵتدا، ئەوە ناماقووڵ بوو. بەڵام من هێندە بەختەوەر بووم، هێندە بەختەوەر بووم... عاشق بووبووم و هەروەها تۆقیبووشم. ئەوە ئاسایی بوو هێندە بەختەوەر بم؟ ئەوە دروست بوو؟ دەبوو لە بری هەموو ئەوە چ باجێک بدەم؟
لەبەر ئەوەی... ئایا لەبەر چۆنێتیی پەروەردەبوونم بوو، یان ئەوەی قەشەکان پێیان گوتبووم؟ ئەوە لە کارەکتەری خۆمدا هەبوو؟ من دایم لەوەدا باش نیم شتەکان بە ڕوونی ببینم، بەڵام یەک شت گومانی تێدا نییە: من هەمیشە خۆم بە بارگیرێک بەراورد کردووە. لغاو، جڵەو، چاوبەست، هەوجاڕ، نیرە، عەرەبانە و هێڵی جووت... هەموو شتەکە. لەو

کاتەوەی کوڕێکی منداڵکار بووم، بە سەری نەوییەوە بە شەقامدا دەڕۆشتم، چاوم دەبڕییە عەرز، وەک ئەوەی زەمینێکی ڕەقی قەتماغەیی بێت و پێویست بێ هەڵتەکێنرێت.
هاوسەرگیری، خێزان، کار، ڕێگەی پێچەڵپێچی ژیانی کۆمەڵایەتی، هەموو شتێک. من هەمیشە بە سەری نەوی و شەویلگەی گیرەلێدراوەوە کارم کردووە. لە هەموو شت ترساوم. بەگومان. من لە تێنسی دیواردا[15]. زۆر باشم، یان باش بووم، ئەوەش بە ڕێکەوت نییە— حەزم لەو هەستەیە لە ژوورێکی تەنگەبەردا زیندانی بم، بە هەموو هێزم زرمە لە تۆپێک هەستێنم، بۆ ئەوەی وەک گوللەتۆپ بگەڕێتەوە سەرم. زۆر حەزم لەوەیە.
"تۆ حەزت لە تێنسی دیوارە و من حەزم لە تۆپی هەڵواسراوە[16] ئەوەش هەموو شتێک ڕوون دەکاتەوە..." **مەتیلدا** ئێوارەیەکیان لەگەڵ شێلانی شانە ئێشاوەکەمدا گوتی. ساتێک بێدەنگ بوو، ئینجا گوتی، "باش وایە بیر لەوە بکەیتەوە کە من ئێستا گوتم، ئەوەندە دەبەنگانە نییە، ئەو کەسانەی لە ناخدا ڕەقن، هەمیشە

---

[15] Squash.

[16] Swingball.

خۆیان به ژیاندا دەکێشن و لەو پرۆسەیەشدا خۆیان ئازار دەدەن، بەڵام ئەو کەسانەی نەرمن- نا، نەرم نا، *بەکێشمان* وشەکەیە- ئا، ئەوەتا، بەکێشمانن لە ناخدا، ئێ، کاتێک لێ دەدرێن، کەمتر ئازار دەکێشن... پێم وایە تۆ دەبێت، یاریی تۆپی هەڵواسراو بکەیت، زۆر خۆشترە. لە تۆپەکە دەدەیت و نازانیت لە کوێوە دەگەڕێتەوە، بەس دەزانیت کە دەگەڕێتەوە چونکە پەتەکەی پێوەیە و بۆ ساتێک دڵەڕاوکێیەکی خۆش دروست دەکات. بەس دەبینیت، بۆ نموونە، من هەندێ جار پێم وایە... من تۆپە هەڵواسراوەکەی تۆم..."
من کاردانەوەم نەبوو و ئەویش بە بێدەنگی بەردەوام بوو لەسەر شیلانم.



- تۆ قەت بیرت لە دەستپێکردنەوەی ژیان لەگەڵ ئەودا دەکردەوە؟
- هەڵبەت. هەزاران جار.

هەزاران جار ویستوومە و هەزاران جار دەستم لێ هەڵگرتووە... یەکڕاست چوومەتە لێواری کەندڕ، چەمیومەتەوە بەسەریدا و ئینجا

هەڵاتووم. هەستم کردووە بەرپرسیارم بەرامبەر **سوزان**، بەرامبەر منداڵەکان.
بەرپرسیار لە چی؟ ئەوەش پرسیارێکی قورسی ترە... من وابەستە بووم. واژۆم کردبوو، بەڵێنم دابوو، دەبوو ئەرکەکانم جێبەجێ بکەم. **ئەدریان** شازدە ساڵی بوو و هیچ شتێک بە ڕێی ڕاستدا نەدەڕۆشت. بەردەوام قوتابخانەی دەگۆڕی، لە ئەسانسێرەکەدا بە ئینگلیزی بە شقلیپقلی نووسیبووی *هیچ داهاتوویەک* نییە، تاکەشتیش لە مێشکیدا بوو ئەوە بوو بچێت بۆ لەندەن و جرجێکی ماڵی لەگەڵ خۆی بهێنێتەوە. **سوزان** پەرێشان بوو. ئەوە شتێک بوو لەو بەهێزتر. کێ کوڕە بچکۆلەکەی ئەوی گۆڕیبوو؟ بۆ یەکەمجار ئەوم بینی نووچی دا؛ هەموو ئێوارەکانی دەگوزەراند بێ ئەوەی وشەیەک بڵێت. نەمدەتوانی خۆم بێنمە پێش چاوم بەو شێوەیەی بارودۆخەکە خراپتر بکەم. بە خۆمم گوت... بە خۆمم گوت کە...

- چیت بە خۆت گوت؟
- بۆستە دەقەیەک، زۆر شێواوە بەسەر یەکدا... دەبێت ئەو وشانەم بیر بکەوێتەوە کە ئەوسا بە کارم هێنان... دەبێت شتێکی ئاوام بە خۆم

گوتبێت: "من نموونەم بۆ منداڵەکانم. ئەوان ئەوەتان لە سەرەتای گەورەبوونیاندا، خەریکن بە دیوارەکەدا هەڵدەزنێن، کاتێکە ئەوان بیر لە بڕیارە گرنگەکان دەکەنەوە. چ نموونەیەکی ناشرینە بۆ ئەوان، ئەگەر لە ئێستادا من دایکیان بە جێ بهێڵم..." لە ڕاستیدا بیروباوەڕێکی بڵندە، پێت وا نییە؟، "ئەوان دواتر چۆن ڕووبەڕووی شتەکان دەبنەوە؟ من چ پاشاگەردانییەک دەنێمەوە؟ چ زیانێک کە چاککردنەوەی بۆ نییە؟ من باوکێکی پێرفێکت نیم، دوورم لەوە، بەڵام هێشتا بەرچاوترین نموونەم بۆ ئەوان، نزیکترینیش، بۆیەش... هممم... من دەبێت زاڵ بم بەسەر خۆمدا."

دەموچاوی گرژ کرد.

- ئەوە باش نەبوو؟ تۆ دەبێت ددان بەوەدا بنێیت کە ئەوە شتێکە لە کڕین نایەت، مەگەر نا؟

هیچم نەگوت.

- من بە تایبەت بیرم لە **ئەدریان** دەکردەوە... لەوەی ببم بە نموونەی بەرپرسیارێتی بۆ کوڕەکەم، **ئەدریان**... تۆ حەقتە لەوەیاندا بە

دزییەوە لەگەڵمدا پێبکەنیت، دەزانیت. مەیگێڕە دواوە. زۆر ڕێ ناکەوێت گوێت ِلە نوکتەیەکی باش ببێت.

سەرم ڕاوەشاند.

- کەچی... ئۆهـ کەڵکی چییە؟ ئەوە هەمووی ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر بوو... ماوەیەکی زۆر زۆر لەمەوبەر...
- کەچی چی؟
- ئێ... لە ساتێکدا من زۆر لە کەندرٍ نزیک بوومەوە... زۆر زۆر نزیک... کەوتمە گەڕان بۆ شووقەیەکی بچکۆلە. بیرم لەوە کردەوە بۆ کۆتاییی حەفتە کریستین بەرم. بیرم لەوە کردەوە چی بڵێم؛ لە ئۆتۆمبیلەکەمدا مەشقم لەسەر چەند چیرۆکێکی دیاریکراو کرد. تەنانەت وادەیەکیشم لەگەڵ ژمێریارەکەمدا دانا، ئینجا بەیانییەکیان– چاولێکە ژیان چۆن دەتوانێت کلکت پێوە بکات– **فرانسواز** بە فرمێسکەوە هاتە ئۆفیسەکەم...
- **فرانسواز**؟ سکرتێرەکەت؟
- بەڵێ.

مێردەکەی تازەکی بەجێی هێشتبوو... من چیتر ئەوم نەناسییەوە. ئەو هەمیشە هێندە بەشەوقوزەوق بوو، هێندە زۆردار، ئەم ژنە بچکۆلەیەی، کە هەم خۆی و هەم دنیای بە دەست بوو- تەماشام کرد ڕۆژ بە ڕۆژ دەفەوتا. چاوی بە فرمێسکەوە، کێشی دادەبەزی، لەتری دەدا، ئازاری دەکێشا. خراپ ئازاری دەکێشا. حەبی دەخوارد، کێشی زیاتر دابەزی و یەکەمین مۆڵەتی نەخۆشیی لە ماوەی پیشەکەیدا وەرگرت. دەگریا. تەنانەت لە بەردەم منیشدا گریا. ئەی من چیم کرد، بەو داوێنپاکییەی خۆمەوە؟ گووم کردە ئازایەتییەکەی خۆم و... کەوتمە شوێن قەرەباڵغی. چ *حەرامزادەیەکە*، من هاوڕا بووم، چ حەرامزادەیەکە. چۆن دەتوانێت ئەوە بەرامبەر ژنەکەی خۆی بکات؟ چۆن دەتوانێت هێندە خۆپەرست بێت، دەرگا داخات و دەستی خۆی لە هەموو شتێک بشوات؟ لە ژیانی خۆی بڕواتە دەرەوە وەک ئەوەی بۆ پیاسەیەک بچێت؟ بۆچی... بۆچی، ئەوە هێندە ئاسان بوو! هێندە ئاسان!

نا، بەڕاستی، چ حەرامزادەیەکە. ئەو پیاوە چ حەرامزادەیەک بوو! نا، گەورەم، من وەک تۆ

نیم! من ژنەکەم جێ ناهێڵم، گەورەم. من ژنەکەم جێ ناهێڵم و قێزم لە تۆ دەبێتەوە... بەڵێ، لە قووڵاییی ڕۆحمەوە قێزم لێت دەبێتەوە، گەورەم!

من ئاوا بیرم کردەوە. بەس هەر لە ئەندازە بەدەر دڵخۆش بووم هێندە ئاسان لێی بێمە دەرەوە. هەر لە ئەندازە بەدەر دڵخۆش بووم دەروونم دامرکێنمەوە و دەست بە ڕیشمدا بێنم. ئۆهـ بەڵێ، من پشتگیریی فرانسوازی خۆمم کرد، نازیم کێشا. ئۆهـ بەڵێ، زۆرجار هاوڕا بووم. ئۆهـ نا، بەردەوام بۆم دووبارە دەکردەوە، تۆ چ بەختێکی بەدت هەبوو. چ بەختێکی بەد...

ڕاستییەکەی، من دەبوو بە نهێنی سوپاسی ئەم پیاوە بکەم، ئەم مستەر **جارمێت**ـە، کە نەمدەزانی سەروبیچمیشی چۆنە. من بە نهێنی سوپاسگوزاری بووم. ئەو چارەسەرەکەی لەسەر سینی زیوین پێشکەش کردم. سوپاس بۆ ئەو، سوپاس بۆ ڕەفتارە ئابڕووبەرەکەی، دەمتوانی بە سەری بەرزەوە بگەڕێمەوە سەر باروگوزەرانە ڕاحەت و بچوکەکەی خۆم. کار و خێزان و لادێ، ئەوە من بووم. سەری بەرز و ڕۆشتنی قنج! شانازیم بە خۆمەوە دەکرد بۆ

ئەوە، وەک دەتوانی وێنای بکەیت، دەمناسیت... گەیشتمە دەرەنجامێکی ماقووڵ کە... من وەک خەڵکی تر نیم. من پلەیەک لەسەروو ئەوانەوەم. زۆر نا، بەس لە سەرووەوە. من ژنەکەم جێ ناهێڵم، نەخێر، ئەوە من نیم...

- ئەوە ئەو کاتە بوو کە لەگەڵ **مەتیلدا** لە یەک جیا بوونەوە؟
- جا بۆچی؟ نا، بە هیچ جۆرێک. بەردەوام بووم لە بینینی، بەس پلانەکانی هەڵهاتنم خستنە لاوە و وازم لەوە هێنا کاتی خۆم بە سەیرکردنی شووقەی بچکۆلەی ترسناکەوە بە فیڕۆ بدەم. چونکە وەک بە ڕوونی نیشانم دایت دەبینی، ئەو شتانە لە بونیاتی مندا نەبوون: من لەوەدا نەبووم شارەزەردەواڵە بورووژێنم. ئەوە بۆ جۆرە نابەرپرسەکان بوو، هەموو ئەوە. بۆ مێردێک کە لەگەڵ سکرتێرەکەیدا خیانەت دەکات.

لاقرتێ دەنگی پڕ کردبوو، لە تورەییشدا دەلەرزی.

- نا لەو جیا نەبوومەوە، بەردەوام بووم لەوەی نەرم نەرم هەڵی بخڵەتێنم، بەڵێنی شتی وەک *هەمیشە* و *دواتری* پێ بدەم.

- بەڕاست؟
- بەڵێ.
- یانی وەک هەموو ئەو چیرۆکە پڕوپووچانەی کە هەن؟
- بەڵێ.
- تۆ داوات لێ دەکرد سەبری هەبێ و بەڵێنی هەموو جۆرە شتێکت پێ دەدا؟
- بەڵێ.
- ئەو چۆن تاقەتی گرتبوو؟
- نازانم، بەڕاستی. نازانم...
- لەوانەیە لەبەر ئەوەی خۆشی ویستووی؟
- دەشێت.

چۆڕی لە گڵاسەکەی بڕی.

- دەشێت، وا بێ... ڕەنگە خۆشی ویستبم...
- تۆش بە هۆی **فرانسوازەوە** نەڕۆشتی؟
- ڕێک وایە. بە هۆی جان-پۆڵ جامیتەوە، بۆ ئەوەی وردتر بین. ڕاستی، ئێستا من وا دەڵێم، بەس ئەگەر ئەویش نەبوایە، بیانوویەکی ترم دەدۆزییەوە. مرۆڤە دووڕووەکان لە بیانوودۆزینەوەدا باشن. زۆر باشن.
- بە عەقڵدا ناچێت...

- چی؟
- ئەم چیرۆکە... کە دەبینیت لەسەر چی بەنگ بووە. بە عەقڵدا ناچێت.
- نا، **کلۆوی** ئازیزی من، بە عەقڵدا دەچێت... زۆر باش بە عەقڵدا دەچێت. ئەوە ژیانە. ژیان بۆ نزیکەی هەموو کەس بەو چەشنەیە. خۆمان دەشارینەوە، ئامادەکاری دەکەین، ترسنۆکییەکەمان لە نزیک خۆمانەوە ڕادەگرین، وەک ئاژەڵێکی ماڵی. *سی لا ڤی*[١٧]. ئەوانە هەن کە ئازان و ئەوانەش کە جێگیر دەبن، جا زۆر کەمتر ماندوو دەبیت ئەگەر جێگیر بیت... ئەو بوتڵەم بدەری.
- بەتەمای خۆت سەرخۆش کەیت؟
- نا من سەرخۆش نابم. قەت نەمتوانیوە سەرخۆش بم. تا زیاتر دەخۆمەوە، زیاتر عاقڵ دەبم...
- چ ناخۆشە!
- وەک تۆ دەڵێیت، چ ناخۆشە... دەتوانم نەختێکت پێشکەش بکەم؟
- نا، سوپاس.
- حەزت لەو چا گیاییە هەیە ئێستا؟

---

[١٧] بە فرەنسی: ژیان ئاوایە.

- نا، نا. من... نازانم من چی... لەوانەیە واقم وڕ مابێت.
- واقت لە چی وڕ ماوە؟
- لە تۆ، هەڵبەتە! قەت گوێم لە تۆ نەبووە لە دوو ڕستە زیاتر بڵێیت لە یەک کاتدا، تۆ قەت دەنگت بەرز ناکەیتەوە، قەت فیلم ناسازێنێت. یەکجاریش چییە، لەو کاتەوەی یەکەمجار تۆم بینی ڕۆڵی لێکۆڵەری مەزنت[18] دەگێڕا. قەت تۆم بە ڕەفتارێکی نەرم یان ناسکەوە نەبینی، ئێستاش، لە ناکاوێکدا، ئەو هەمووەم بە سەردا فڕێ دەدەیت بێ ئەوەی تەنانەت هاوار بکەیت *خەبەردار*!...
- تۆ ئەمە بە مایەی دڵداخورپان دەبینی؟
- نا، بە هیچ شێوەیەک! ئەوە نییە! بە پێچەوانەوە... بەڵام... بەڵام تۆ چۆن توانیوتە ئەو هەموو وەختە ئەو ڕۆڵە بگێڕیت؟
- کام ڕۆڵ؟
- ئەوە... ڕۆڵی پیرەزۆڵەکە.
- بەڵام، **کلۆوی** من پیرەزۆڵێکم! من پیرەزۆڵێکم– ئەمەیە من لەوساوە هەوڵ دەدەم بۆت ڕوون بکەمەوە!

---

[18] لە برایانی کارامازۆفی دۆستۆیۆفسکییەوە.

- بەس نا! ئەگەر تۆ خۆت ئەوە بزانیت، لەبەر ئەوەیە کە پاشی هەموو شتێک تۆ هەو نیت. پیرەزۆڵە ڕاستەقینەکان خۆیان ئاگایان لە هیچ نییە!
- پههشششش، بڕوا بەوە مەکە... ئەوە هەر فیڵێکی ترە لە فیڵەکانم بۆ ئەوەی بە سەری بەرزەوە لەمە بێمە دەرەوە. من لەو ڕووەوە زۆر بەهرەدارم...

بزەی بۆ کردم.

- بە عەقڵدا ناچێت، بەس بە عەقڵدا ناچێت.
- چی؟
- هەموو ئەمە. هەموو ئەو شتانەی تۆ بۆت باس کردم.
- نا، نەک بە عەقڵدا دەچێت، بەڵکوو زۆر پڕوپووچیشە.

زۆر، زۆر پڕوپووچە... من بۆیە پێت دەڵێم چونکە ئەوە تۆیت، چونکە ئەوە لێرەدایە، لەم ژوورەدا، لەم ماڵەدا، چونکە شەوە و چونکە ئەدریان ئازاری داویت. چونکە هەڵبژاردنەکەی ئەو وام لێ دەکات هەم هەست بە نائومێدی بکەم هەمیش دڵنیایی. چونکە حەز ناکەم بە

دڵتەنگی بتبینم. من خۆم هۆکاری ئازاری زۆر بووم... چونکیشە من وام پێ باشترە بتبینم ئەمڕۆ ئازارێکی زۆر بکێشیت، لەوەی کەمە کەمە ئازار بکێشیت تا ژیانت ماوە.
من خەڵک دەبینم کەمەکێک ئازار دەکێشن، هەر کەمەکێک، ئەسڵەن زۆر نییە، هەر باییی ئەوەندەی بە تەواوەتی ژیانیان وێران بکات... بەڵێ، لەم تەمەنەی مندا، ئەوە زۆر دەبینم... ئەو کەسانەی هێشتا پێکەوەن چونکە لەژێر قورساییی ئەو شتە بچکۆلە بێفەڕەدا پلیشاونەتەوە– ژیانە بچکۆلە ئاساییەکەیان. ئەو هەموو قوربانیدانە، ئەو هەموو دژیەکییە... هەموو ئەوە بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا...
براڤۆ! هێیی! ئێمە توانیمان هەمووی بکەین بەژێر خۆڵەوە: هاوڕێکانمان، خەونەکانمان، عەشقەکانمان، ئێستاش، سەرەی ئێمەیە! براڤۆ، هاوڕێکانم، براڤۆ!

چەپڵەی لێ دا.

- خانەنشینان، وایان پێ دەگوترێت. لە هەموو شتێک خانەنشین کراون. چەندم ڕق لێیانە. ڕقم لێیانە، گوێت لێمە؟ ڕقم لێیانە چونکە خۆم

دەبینمەوە لەوانەدا. ئەوەتان، لە لەخۆڕازیبوونیاندا دەگەوزێن. سەرکەوتین، سەرکەوتین! پێ دەچێت وا بڵێن، بێ ئەوەی قەت بەڕاستی بۆ یەکتر هەبووبن. بەس خوایە، بە چ نرخێک؟ چ نرخێک؟! ئاخوداخهەڵکێشان، پەشیمانی، شکان و سازشکردنێک کە ساڕێژ نابن، هەرگیز ساڕێژ نابن. هەرگیزا تەنانەت لە هێسپەردایسیش.[19] تەنانەت لە ڕاوەستان بۆ وێنەیەک لەگەڵ نەوەی نەوەکانیشدا. تەنانەت لە کاتێکدا کە هەردوو وەڵامی پرسیاری بەرنامە گەمەئامێزەکانی تەلەفزیۆن ڕێک لە هەمان دەقەدا دەدەنەوە.

ئەو پێشتر گوتی قەت سەرخۆش نابێت، بەس...

لە قسەکردن و هێماکردن وەستا. بەو شێوەیە بۆ ساتێکی درێژ دانیشتین. لە بێدەنگیدا. جگە لە دەنگی خەفەی تەقینی ئاگر لە دووکەڵکێشەکەدا.

...

[19] باخی حۆرییەکان، بە پێی ئەفسانەی یۆنانی.

- باسی فرانسوازم بۆ تەواو نەکردیت...

ئەو هێور بووبووەوە و من دەبوو گوێچکەی خۆم ڕاکێشم بۆ ئەوەی بیژنەوم.

- چەند ساڵێک لەمەوپێش، لە ٩٤دا بوو، وا بزانم، ئەو زۆر نەخۆش کەوت... زۆر زۆر... شێرپەنجەیەکی نەفرەتیی تووش بوو، کە بەرەبەرە ناوسکی دەخوارد. سەرەتا هێلکەدانێکیان لا برد، ئینجا ئەوی تر، ئینجا منداڵدانی... من زۆری لێ نازانم، بەڕاستی، ئەو قەت ڕازی خۆی لای من نەدەدرکاند، وەک دەتوانی وێنای بکەیت، بەس دوایی دەرکەوت زۆر لەوە خراپتر بوو کە ئەوان وێنایان کردبوو. فرانسواز ئەو کاتەی دەژمارد کە بۆی مابووەوە. ئەو دەیویست بگاتە کریسمس. جەژنی پاک زۆر بوو ئەو هیوای بۆ بخوازێت. ڕۆژێکیان تەلەفۆنم بۆ کرد بۆ نەخۆشخانەکە و پێشنیاری پاکێجێکی گەورەی بەخشیشم بۆ کرد، تاکوو بتوانێت هەر کات هاتە دەرەوە

بچێت هەموو دنیا بگەڕێت، تاکوو بتوانێت لە باشترین دیزاینەرەکان شت بکڕێت، جوانترین عەزییەکان هەڵگرێت، ئینجاش لەسەر پشتی کەشتییەکی زەرییایی گەورە گەشت بکات و پیم[٢٠] بخواتەوە. **فرانسواز** شەیدای پیم بوو...

"پارەکەت هەڵگرە، لەگەڵ ئەوانی تردا لە ئاهەنگی خانەنشینبوونەکەت دەیخۆمەوە!"

دەمەتەقێمان کرد. ئێمە ئەکتەری باش بووین-یەکی لویەک لە قورگماندا بوو، بەڵام قسەکانمان خۆش بوون. دواهەمین پێشبینیی ماوەی خایاندنی نەخۆشییەکە کارەسات بوو. لە کچەکەیەوە بیستم. گومان هەبوو بیگەیەنێتە کریسمس.

"بڕوا بە هەموو شتێک مەکە کە دەیبیستی، جاریَ ئەو دەرفەتەت بۆ هەڵناکەوێت شوێنەکەم بدەیت بە شتێکی گەنج،" بە چرپەوە سەرزەنشتی کردم، بەرلەوەی تەلەفۆنەکە دابخات. وام نیشان دا بۆڵەبۆڵ دەکەم و خۆم بە فرمێسکەوە لەو ناوەڕاستی پاشنیوەڕۆیەدا بینییەوە. هەروەها بۆشم دەرکەوت من چەندم ئەو بۆ گرنگە. چەندم ئەو پێویستە. حەقدە

---

[٢٠] براندێکی ئاومیوەیە و بە کحولیش دەژمێردرێت.

ساڵ پێکەوە کارمان کرد. هەمیشە، هەموو ڕۆژێک. حەڤدە ساڵ بەرگەی منی گرت، کۆمەکی کردم... ئەو سەبارەت بە **مەتیلدا** دەیزانی و هەرگیز وشەیەکی نەدرکاند. نە لای من، نە لای کەسی تر. کە دڵتەنگ دەبووم ئەو بزەی بۆ دەکردم، کە ڕووم گرژ دەکرد ئەو شانی لێ هەڵدەتەکاندم. تازە بووبوو بە بیست ساڵ، کە هات کار بۆ من بکات. هیچی نەدەزانی، قوتابخانەی هوتێلبەڕێوەبردنی تەواو کردبوو، وازی لە کارێک هێنابوو لەبەر ئەوەی چێشتلێنەرێک نوقورچی لە سمتی گرتبوو. ئەو ئەمەی لە یەکەم دیدارماندا پێ گوتم. ئەو نەیدەویست کەس نوقورچ لە سمتی بگرێت و نەشیدەویست بڕواتەوە لای دایکوباوکی لە **کروس** بژی. تەنیا کاتێک دەیتوانی بڕواتەوە کە ئۆتۆمبیلی خۆی هەبێت، بۆ ئەوەی دڵنیا بێت، کە دەتوانێت جێیان بێڵێت!

من لەبەر ئەو ڕستەیە کارەکەم دایە.

ئەویش، هەروەها، شازادەی من بوو.

ماوەماوە تەلەفۆنم دەکرد بۆ ئەوەی سکاڵا لە جێگرەکەی بکەم.

ئینجا دوای ماوەیەکی زۆر، کە سەرەنجام ئیتر ڕێگەی دام، چووم بۆ دیتنی. لە بەهاردا بوو. نەخۆشخانەکەی گۆڕیبوو. توندوتیژیی داوودەرمانەکەی کەمتر کرابووەوە و بەرەوپێشچوونەکەی یارمەتیی دکتۆرەکانی دابوو، ئەوان هاتنە ئەوێ پیرۆزبایی لێ بکەن، کە ئەو خاوەنی سرووشتێکی باشە و شەڕوانێکی ڕاستەقینەیە. بە تەلەفۆن پێی گوتم، کەوتووەتە ئامۆژگاریکردنی هەموان سەبارەت بە هەموو شتێک. کۆمەڵێک بیرۆکەی گۆڕینی دیکۆری لە سەردا بوو و گرووپێکی لێفەدروونیشی ساز کردبوو، ڕەخنەی لە قەدکردنەکانیان و ناڕێکخراوییان دەگرت. داوای لە من کرد کەسێک لە خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان ببینم بۆ ئەوەی هەندێ کێشەی سادەیان بۆ چارەسەر بکات. من کڵکم پێوە دەکرد و ئەو پارێزگاری لە خۆی دەکرد: "بەس ئەوە شتێکی زگماکییە! شارەزاییەکی باشی زگماکییە و تەواو، دەبینیت!" ئەو گەڕابووەوە سەر شێوازی شەڕکردن و من بە دڵێکی خۆشەوە لێم خوڕی بۆ کلینیکەکە.

لەگەڵ ئەوەشدا، دووبارە بینینەوەی ئەو خورپەیەک بوو. ئەو چیتر شازادەکەی من

نەبوو؛ باڵندەیەکی بچکۆلەی تووشبوو بە زەردوویی جێگەی گرتبووەوە. ملی، گۆناکانی، دەستەکانی، قۆڵەکانی– هەموو شتێک لە بەین چووبوو. پێستی زەردباو و بە جۆرێک زبر، چاوەکانیشی ئەندازەیان دووهێند بووبوو. ئەوەی زیاتر لە هەر شتێک دڵی داخورپاندم باروکەکەی بوو. لەوەبوو بە پەلە کردبێتییە سەری، جا خەتی ناوەڕاستەکەی زۆر لە ناوەڕاستدا نەبوو. هەوڵم دا بە هەواڵەکانی ئۆفیس پڕی بکەمەوە، هەواڵی منداڵەکەی کارۆلاین و ئەو گرێبەستانەی کارمان لەسەر دەکردن، بەڵام خەیاڵم هەر لای باروکەکە بوو. دەترسام بخزێتە خوارەوە.

لەو ساتەدا، پیاوێک لە دەرگای دا. "ۆۆپس!" ئەو گوتی، کە منی بینی بەر لەوەی وەرسوورێت. **فرانسواز** بانگی لێ کردەوە. "**پیێ**، ئەمە **سایمۆن**ـە، هاوڕێکەمە. بڕوا ناکەم ئەو دووانەتان قەت یەکترتان بینیبێت..." من هەستام. نا، قەت یەکمان نەبینیبوو. من نەشمزانیبوو ئەو ئەسڵەن بوونیشی هەیە. ئێمە زۆر نهێنیپارێز بووین، من و **فرانسواز**... پیاوەکە زۆر بە توندی تەوقەی لەگەڵ کردم و هەرچیی میهرەبانی دنیایە لە چاوەکانی ئەودا

بوون. دوو چاوی خۆڵەمێشیی بچکۆلە، بەئاگا، زیندوو و نەرم. تا کاتێک من دانیشتمەوە، ئەو چووە لای **فرانسواز** ماچی بکات، ئینجا دەزانی چی کرد؟

- نەء.
- دەموچاوی ئەو بووکەشووشە شکاوەی خستە نێوان دەستەکانییەوە، وەک ئەوەی بیەوێت بە پەرۆشەوە ماچی بکات و سوودی لەوە وەرگرت تا باروکەکەی بۆ ڕێک بکاتەوە. **فرانسواز** جنێوی دا و پێی گوت وریا بێت، من دواجار سەرۆککاری ئەو بووم، پیاوەکەش پێکەنی بەر لەوەی بڕواتە دەرەوە، بە بیانووی ئەوەی دەیەوێت دەسڕ بهێنێت.

ئینجا کە ئەو دەرگاکەی داخست، **فرانسواز** بە هێواشی ڕووی لە من کرد. چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسک. لەژێر لێوەوە گوتی، "ئەگەر ئەو نەبوایە، ئێستا من دواییم هاتبوو، دەزانیت... ئەگەر من شەڕ دەکەم، لەبەر ئەوەیە زۆر شت هەن دەمەوێ لەگەڵ ئەودا بیانکەم. زۆر شت..."

بزەکەی ترسناک بوو. شەویلگەی زل و تا ڕادەیەکی زۆر ناشرین. هەستم دەکرد، کە ددانەکانی لەوەدان بکەون. کە پێستی گۆناکانی

شەقار دەبن. هێلنج زۆری بۆ هێنابووم. ئینجا بۆنەکەش... بۆنی دەرمان و مەرگ و عەتری گێرلەین هەمووی بە یەکدا تێکەڵ بووبوو. بە ئەستەم خۆم ڕاگرتبوو و دەبوو بجەنگم بۆ ئەوەی دەستم نەخەمە سەر دەمم. وامدەزانی دەرشێمەوە. بیناییم لێڵ بوو. بە حاڵ تێبینی دەکرا، دەزانیت، وام نیشان دەدا لوتم هەڵدەگلۆفم و چاوم دەسڕم وەک ئەوەی تەپوتۆزیان تێ چووبێت. کاتێک دووبارە چاوم بۆ ئەو بەرز کردەوە، زۆرم لە خۆم دەکرد بزە بکەم، ئەو پرسی، "ئەرێ تۆ باشی؟" "بەڵێ، بەڵێ، باشم،" وەڵامم دایەوە. دەمتوانی هەست بە دەمم بکەم وەک ناوچەوانی گرژی منداڵێکی خەمگین لۆچ دەبێت. "من باشم، هیچ نییە... هەر ئەوەیە کە... پێم وا نییە تۆ زۆر باش دیار بیت، **فرانسواز**..." ئەو چاوی داخست و سەری خستە سەر سەرینەکەی. "تۆ نیگەرانی من مەبە. من ئەم نەخۆشییە دەبەزێنم... ئەو پیاوە زۆر پێویستی بە منە، ئەوەیان پێویستی بە منە..."

من تەواو تێکشکابووم کە ڕۆشتم. بە دیوارەکان خۆم دەگرت. چەندم پێ چوو تا بیرم کەوتەوە ئۆتۆمبیلەکەم لە کوێدا ڕاگرتبوو و لە گەراجە نەفرەتییەکەشدا ون بووم. ئەوە چی بوو بەسەر مندا دەهات؟ خوایە، ئەوە چی بوو بەسەر مندا دەهات؟ بینینی ئەو بوو بەو شێوەیە؟ بۆنی ئەو مەرگە لە میکرۆب پاککراوەیە بوو، یان هەر شوێنەکە خۆی؟ تارای سەر تەرمی بەدبەختی و ئازارکێشان. **فرانسوازی** بچکۆلەی منیش بە باڵە داوەشاوەکانیاوە، فریشتەکەی من لە ناوەڕاستی ئەو هەموو زۆمبییەدا[٢١] ون بووە. لە سیسەمە بچکۆلانەکەی خۆیدا ون بووە. ئەوانە چییان لە شازادەکەی من کردووە؟ بۆچی ئاوا ناشرین مامەڵەیان کردووە؟

قەرنێکم پێ چوو ئۆتۆمبیلەکەم بدۆزمەوە و قەرنێکیشم پێ چوو بیخەمە کار، ئینجاش چەند دەقەکم پێ چوو تا بیخەمە گێڕی یەک. ئینجا دەزانی چی؟ دەزانی بۆچی من ئاوا گێژ بووبووم؟ ئەوە نە لەبەر ئەو بوو، نە لەبەر

---

[٢١] Zombi: مردووی گیان بەبەرداکراو لە ئایینی ڤوودوودا

بۆریی میزەکەی، نە لەبەر ئازارەکەی. هەڵبەتە
ئەوە نەبوو. ئەوە...

سەری بەرز کردەوە.

- ئەوە نائومێدی بوو. بەڵێ، بوومەرانەکە[٢٢]
گەڕایەوە و دای لە تەختی نێوچەوانم...

بێدەنگی.

سەرەنجام من گوتم:

- پێی؟
- بەڵێ؟

[٢٢] Boomerang: دارێکی تەختی چەماوەیە، کە هەڵدەدرێت دەگەڕێتەوە

- تۆ پێت وا دەبێت گاڵتە دەکەم، بەس وا بزانم ئێستا دەمەوێت چا گیاییەکە بخۆمەوە...

بە پرتەوبۆڵە هەستایە پێ، بۆ ئەوەی مەمنونێتییەکەی بشارێتەوە.

- ئۆهـ ئێوەی ژن قەت نازانن چیتان دەوێت؛ دەتوانن زۆر وەڕزکەر بن...

بە دوایدا چووم بۆ چێشتخانەکە و تا ئەو مەنجەڵۆکەیەک ئاوی خستە سەر چاوەکە، من لەسەر لای ئەولای مێزەکە دانیشتم. ڕووناکیی گڵۆپە هەڵواسراوەکە قایم بوو، کاتێک ئەو دۆلابەکانی ژێرەوژوور دەکرد، تا داکێشرا گڵۆپەکەم داکێشایە خوارەوە.

- دەتوانم پرسیارێکت لێ بکەم؟
- ئەگەر بتوانیت پێم بڵێی ئەوەی من بۆی دەگەڕێم لە کوێیە.
- ئەوەتا لەوێدایە، لە بەردەمتدا، لە قوتووە سوورەکەدا.
- ئەوە؟ ئێمە قەت نەماندەخستە ئەوێوە، وای دەبینم کە- ئۆهـ ببوورە، گوێم لێتە.
- ئێوە چەند ساڵ پێکەوە بوون؟
- لەگەڵ مەتیلدا؟
- بەڵێ.

- له مابەینی هۆنگ کۆنگ و دواگفتوگۆماندا، پێنج ساڵ و حەوت مانگ.
- ئەی زۆرتان کات پێکەوە دەبردە سەر؟
- نا، پێشتر پێم گوتی. چەند سەعاتێک، چەند ڕۆژێک...
- ئەی ئەوە بەس بوو؟

هیچی نەگوت.

- تۆ ئەوەت بەس بوو؟
- نا، هەڵبەت نا. ئێ، ڕاستی ئا، مادەم قەت شتێکم نەکرد بۆ ئەوەی بارودۆخەکە بگۆڕم. دواتر من ئەوەم بە خۆم گوت. ڕەنگە گونجاو بووبێت بۆ من. "گونجاو"- چ وشەیەکی ناشرینە ئەوە. دەشێت گونجاو بووبێت بۆ من لە لایەکەوە بۆ دڵنیایی هاوسەرم هەبێت و لە لاکەی تریشەوە وورووژان. هەموو شەوێک شێو لەسەر مێز هەبێت و ئەو هەستەش کە دەتوانم ماوەماوە خۆم بدزمەوە... گەدەی پڕ و هەموو ئاسوودەییەکانی ماڵ. ئەوە هەم بەکارم دەهات و هەمیش ڕاحەت بوو.
- تۆ کاتێک تەلەفۆنت بۆ ئەو دەکرد کە پێویستت پێی دەبوو؟

- بەڵێ، کەمتازۆر حاڵەتەکە ئاوا بوو...

کوپێکی لە بەردەممدا دانا.

- ئێ، نا، ڕاستییەکەی... ڕێک ئاوا نەبوو... ڕۆژێکیان، هەر لە سەرەتادا، ئەو نامەیەکی بۆ نووسیم. بەو بۆنەیەوە تاکەنامەیەک بوو، کە ئەو هەرگیز ناردبێتی. ئاوا بوو:

بیرم لێ کردووەتەوە، هیچ خەون و خەیاڵێکم نییە، خۆشم دەوێیت بەڵام متمانەم پێت نییە. چونکە ئەوەی ئێمە لەناویدا دەژین ڕاستەقینە نییە، ئەوە یارییە. لەبەر ئەوەش کە یارییە، دەبێت ڕێسامان هەبێت. نامەوێت تۆ لە پاریس ببینم. نە لە پاریس و نە لە هیچ شوێنێکی تر کە تۆ تێیدا ترست هەبێت. کاتێک لەگەڵ تۆدام، دەمەوێت لەسەر شەقام دەستت بگرم و لە ڕیستۆرانەکان ماچت بکەم، ئەگەر وا نەبێت بە کەڵکی من نایەت. من لەوە زۆر بەتەمەنترم یاریی پشیلە و مشک بکەم. بۆیە، من و تۆ تا بتوانین لە دوورترین شوێن یەکتر دەبینین، لە وڵاتانی تر. کە زانیت لە کوێ دەبیت، نامەم بۆ ئەم ناونیشانە بۆ دەنووسیت، ماڵی خوشکەکەمە لە

لەندەن. ئەو دەزانیت بۆ کویێ بۆم ڕەوانە بکات. عەزیزتی خۆت مەدە نامەی عاشقانە بنووسیت، بەس کات و شوێنەکە بنووسە. پێم بڵێ لە چ هوتێلێکیت و کەی و لە کوێ. ئەگەر بتوانم بێمە لات، ئەوا دێم، ئەگەر نا ئەوە بە داخەوە. هەوڵ مەدە تەلەفۆنم بۆ بکەیت، یان بزانیت لە کوێم یان چۆنم، چیتر ئەمە مەسەلە نییە. باش بیرم لێ کردووەتەوە، پێم وایە ئەوە باشترین چارەیە: منیش وەک تۆ بکەم، ژیانی خۆم بژیم و دووراودووریش عاشقی تۆ بم. نامەوێت چاوەڕێی تەلەفۆنەکانت بکەم، نامەوێت خۆم لە عاشقبوون لا بدەم، دەمەوێت توانای ئەوەم هەبێت لەگەڵ هەر کەسێک بخەوم کە بمەوێت، لە هەر کاتێکدا کە بمەوێت و بەبێ دوودڵییش. چونکە تۆ ڕاست دەکەیت، ژیان بەبێ دوودڵی... *لەبارترە*. من بەو شێوەیە شتەکان نابینم، بەس بۆ نا؟ تاقییەکی دەکەمەوە. چیم هەیە لە کیسم بچێت، پاشی هەموو شتێک؟ پیاوێکی ترسنۆک؟ ئەی دەبێت چیم دەست بکەوێت؟ چێژی هەندێ جار خەوتن لە باوەشی تۆدا... بیرم لێ کردووەتەوە، دەمەوێت تاقییەکی بکەمەوە. بە دڵتە ئەوەیە و بە دڵیشت نییە هەر ئەوەیە...

- چییە ئەوە؟
- هیچ. خۆشە کە دەبینم نەیارێکی هاوتای خۆتت دۆزیوەتەوە.
- نا، بەدبەختانە نەمدۆزییەوە. هەرچەند زۆری لە خۆی کرد و وەک **فیم فەتاڵ**[٢٣] ڕەفتاری کرد، بەڵام ئەو لە ڕاستیدا ژنێکی میهرەبان بوو. من ئەو کاتەی پێشنیارەکەیم قبووڵ کرد ئەوەم نەدەزانی، زۆر درەنگتر لەوە تێگەیشتم.

پێنج ساڵ و حەوت مانگ دوای ئەوە...

لە ڕاستیدا، ئەوە درۆیە. من نێوانی دێرەکانم خوێندەوە، ئەوەم پێشبینیی دەکرد دەبێت ئەو جۆرە دەربڕینانە چەند لەسەر ئەو کەوتبن. بەس من نەدەچووم زۆر بیر لەوە بکەمەوە، چونکە ئەو ڕێسایانە باش بۆ من دەگونجان. تا سەر ئێسک بۆ من دەگونجان. هەر ئەوەندەم لەسەر بوو بەشی هاوردە و ناردەنییەکان پەرە پێ بدەم و لەگەڵ سەفەرە کتوپڕەکاندا ڕابێم و تەواو. نامەیەکی ئاوەها خوا دەینێرێت بۆ پیاوانێک کە دەیانەوێت خیانەت لە ژنەکانیان بکەن بێ ئەوەی دووچاری ئاڵۆزییەک ببنەوە. هەڵبەتە، بێتاقەت بووم بەو

[٢٣] Femme fatale: کارەکتەری ژنێکی جوان و فریودەرە، کە هەر پیاوێک لەگەڵیدا تێکەڵ ببێت، دواجار تووشی کارەساتی دەکات

هەموو قسانەی سەبارەت بە لەگەڵ ئەموئەودا خەوتن و عاشقبوون دەكران، بەس ئێمە هێشتا نەگەیشتبووینە ئەوە...

لە سەری ئەوسەری مێزەكەدا، لە شوێنی عادەتیی خۆیدا دانیشت.

- ئەوە زۆرزانیی من بوو، ها؟ ئۆهـ كەواتە من زۆرزانەكە بووم...
بە تایبەت كە هەموو ئەو شتە یارمەتیی دام پارەیەكی زۆر پەیدا بكەم... من دایم تۆزێك لایەنی نێودەوڵەتیی بزنسەكەم پشتگوێ خستبوو...
- ئەو هەموو سینیسیزمە[٢٤] بۆچی؟
- تۆ تۆزێك لەمەوپێش وەڵامێكی باشی ئەوەت دایەوە...

من چەمیمەوە بۆ ئەوەی چاپاڵێوەكە بێنم.

---

[٢٤] Cynicism: بیروبڕوایەكە، كە مرۆڤەكان شایستەی متمانە نین و هەرچییەك دەكەن لە خۆپەرستییەوەیە، هەر ئەوە بە جۆرێك لە لاقرتێ و گاڵتەپێكردنیش دێت.

- بگره ئەوە زۆریش ڕۆمانسی بوو... لە فڕۆکە دادەبەزیم، دڵم دەکەوتە لێدان، دەچوومە هوتێلەکە بەو هیوایەی کە کلیلەکەم بە قولاپەکەیەوە نەمابێت، جانتاکانم لە ژوورگەلی نامۆدا دادەنا، دەوروبەرم دەپشکنی تا بزانم ئەو پێشتر هاتووە، دەچووم بۆ کار، ئێوارە دەهاتمەوە لە خوا دەپاڕامەوە ئەو لە جێخەوەکەمدا بێت. هەندێ جار لەوێ دەبوو، هەندێجار نا. ئەو لە نیوەشەودا دەهاتە لام و خۆمان لە یەکتردا ون دەکرد، بێ ئەوەی یەک وشە بگۆڕینەوە. لەژێر سەرچەفەکانەوە پێدەکەنین، سەرمان دەسووڕما لەوەی پێکەوە لەوێین. سەرەنجام، لەو دووری دوورە و بەو نزیکییە. هەندێ جار، ئەو ڕۆژی دوایی دەهات و من شەوەکەم بە دانیشتن لە بارەکە و گوێهەڵخستن بۆ دەنگێک لە ڕاڕاوەکەوە دەبردە سەر. هەندێ جار ئەو ژوورێکی بۆ خۆی دەگرت، فەرمانی پێ دەدام لە سەعاتەکانی بەیانی زوودا بچمە لای. هەندێ جار نەدەهات و من ڕقم لێی هەڵدەستا. بە مەزاجێکی زۆر خراپەوە دەگەڕامەوە بۆ پاریس. سەرەتا، ئیشێکی زۆرم دەبوو بیانکەم؛ دواتر، کەمتر و کەمتر دەبووەوە... بیانوویەکم دەدۆزییەوە بۆ

ئەوەی بتوانم بڕۆم. هەندێ جار تۆزێک وڵاتەکەم دەبینی و هەندێ جاریش جگە لە ژووری هوتێلەکەم هیچم نەدەدی. هەندێ جار ئەسڵەن هەر لە فڕۆکەخانە نەدەڕۆشتینە شوێنی تر. ئەوە بێمانا بوو. هیچ لۆجیکی تێدا نەبوو. هەندێجار بێ ڕاوەستان قسەمان دەکرد و هەندێ جاریش هیچمان نەبوو بە یەکتری بڵێین. قسەی خۆی بردە سەر، مەتیلدا قەت باسی لایەنی خۆشەویستیی ژیانی خۆی نەکرد، یان تەنیا لە کاتی قسەوباسی سەر سەریندا دەیکرد. باسی پیاوانێک و بارودۆخگەلێکی وەهای دەکرد منی شێت دەکرد، بەس ئەوە هەر لە کاتی سەرجێییدا بوو. من بە تەواوەتی کەوتبوومە ژێر بەزەییی ئەو ژنەوە، ئەو شێوازە تا ڕادەیەک شەیتانییەی ئەو هەیبوو، کە وا خۆی نیشان دەدا ناوی پیاوێکی تر دەڵێت لە تاریکییەکەدا. وەڕزانە ڕەفتارم دەکرد، بەڵام من وێران بووم. تەنانەت بە زەبرێکی زیاترەوە ئەوم ژێربار دەهێنا، لە کاتێکدا من تەنیا دەمویست توند لە ئامێزمی بگرم.

کە یەکێکمان گاڵتەی دەکرد، ئەوی ترمان ئازاری دەکێشا. شتێکی تەواو پڕوپووچ بوو.

خەیاڵم دەکردەوە بیگرم و ڕایوەشێنم هەتا چی کینە و ڕقیەتی هەڵدەوەرێت. هەتا پێم دەڵێت خۆشی دەوێم. هەتا پێم دەڵێت خۆشی دەوێم، هەرهەمووی بە نەفرەت بێت. بەڵام نەمتوانی، ئەوە من بووم حەرامزادە بووم. هەموو ئەوە خەتای من بوو...

هەستایە پێ گڵاسەکەی بدۆزێتەوە.

- من چیم لە سەردا بوو؟ ئەوەی کە ئیتر ئاوا چەندین ساڵ بەردەوام بێت؟ چەندین ساڵ بێ وەستان؟ نا، بڕوام بەوە نەبوو. ئێمە بێ خشپە، خەمگینانە، نائاساییانە خواحافیزیمان لە یەک دەکرد، بێ ئەوەی قەت باسی جاری داهاتوو بکەین. نا، ئەوە بە کاری ژیان نەدەهات... تا زیاتریش دوودڵ دەبووم، زیاتر ئەوم خۆش دەویست، تا زیاتریش خۆشم دەویست، کەمتر بڕوام بە بارودۆخەکە دەما. هەستم دەکرد نوقم بووبم، بێهێز بووم، بووبووم بە تۆڕێکەوە خۆم دروستم کردبوو. چەقیبووم و ملم کەچ کردبوو.
- ملت بۆچی کەچ کردبوو؟
- بۆ ئەوەی ڕۆژێک ئەو لە دەست دەدەم...

- تێناگەم.
- ئۆهـ با، تێدەگەیت. تێدەگەیت من چی دەڵێم... من چیم بکردایە؟ وەڵامی ئەوەم بدەرەوە.
- ناتوانم.
- نا، هەڵبەت ناتوانی وەڵام بدەیتەوە... تۆ دواهەمین کەسی لە دنیادا، کە بتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارە بدەیتەوە.
- تۆ بە وردی بەڵێنی چیت پێ دابوو؟
- ئێستا بیرم ناکەوێتەوە... زۆر نەبوو، وێنا دەکەم، یان ئەوەی وێنانەکراو بوو. نا، زۆر نەبوو... کەرامەتی ئەوەم هەبوو چاوم دابخەم کاتێک ئەو پرسیاری لێ دەکردم و ماچی بکەم کاتێک ئەو چاوەڕێی وەڵامی لێ دەکردم. من نزیکی پەنجا ساڵ بووم و پێم وا بوو پیرم. پێم وا بوو ئەمە کۆتاییی ڕێگاکەیە، کۆتاییەکی ڕووناک و خۆش... بە خۆمم گوت: "پەلە لە شت مەکە، ئەو زۆر گەنجە، بۆیە ئەو یەکەم کەس واز دەهێنێت." هەرچیی جارێکیش ئەوم دەبینییەوە، سەرم دەسووڕما و ئاشبگیریش دەبووم. چیی؟ ئەوە هێشتا لێرەیە؟ بەس بۆ؟ زۆرم بە لاوە زەحمەت بوو بزانم ئەو حەزی لە چ شتێکی من کردووە و بە خۆمم گوت، "بۆچی خۆم تووشی سەرئێشە بکەم، مادەم

ئەو هەر وازم لێ دەهێنێت؟" ئەوە هەر دەبوو ڕوو بدات، بە دڵنیایی ڕووی دەدا. ئەو هیچ هۆیەکی نەبوو بۆ ئەوەی جاری داهاتووش هێشتا هەر لەوێ بێت، هیچ هۆیەک بە هیچ جۆرێک... لە پاشدا، من تەقریبەن وام لێ هاتبوو هیوام دەخواست، ئەو لەوێ نەبێت. تا ئەو کات، ژیان ئەوەندە میهرەبان بوو، کە بڕیاری هەموو شتێکی بۆ من دەدا، ئێستا بۆچی ئەوە بگۆڕێت؟ بۆچی؟ من ئەوەم سەلماندبوو، کە توانای ئەوەم نییە شتەکان بگرمە دەستی خۆم... بزنس، ئا، ئەوە یارییەک بوو و من تێیدا یەکەم بووم، بەڵام لە بەرەی ماڵەوەدا؟ وام پێ باشتر بوو ئازار بکێشم؛ دەمویست بەوە دڵخۆشی خۆم بدەمەوە، کە ئەوەی ئازار دەکێشێت منم. دەمویست یان بە خەیاڵەوە بژیم یان پەشیمان ببمەوە. بەو شێوازە زۆر سادەترە...

پورە گەورەکەم لە باوکمەوە، ڕووسی بوو، جا دایم پێی دەگوتم:

"تۆ، تۆ لە باوکم دەچیت، نۆستالجیات بۆ چیاکان هەیە."

"کام چیایانە، **موچکا**؟" من دەمپرسی.

"بۆچی، ئەوانەی قەت نەتدیون، هەڵبەتە!"

- وای پێ دەگوتی؟
- بەڵێ. هەرجارێک لە پەنجەرەوە دەمڕوانی ئەو وای دەگوت...
- ئەی تۆ لە چیت دەڕوانی؟
- وێستگەی پاسەکە.

پێکەنی.

- ئەویش کارەکتەرێکی تر بوو تۆ خۆشت لێ دەهات... هەینییەک باسی ئەوت بۆ دەکەم.
- دەچین بۆ **شی دومینیک**، ئەو کاتە...
- پێم گوتیت، هەرکوێ و هەرکات تۆ بتەوێت.

کوپەکەمی پڕ کرد لە چا.

- بەس ئەی **مەتیلدا**، ئەو هەموو وەختە چی دەکرد؟
- نازانم... کاری دەکرد. لە یونسکۆ کارێکی پەیدا کردبوو، بەس دواتر زوو وازی لێ هێنا. حەزی لە وەرگێڕانی قسە لووسەکانیان نەبوو. بەرگەی ئەوەی نەدەگرت ڕۆژ لە دوای ڕۆژ قەتیس ببێت، بێهۆشانە قسەی زلی سیاسییەکان دووبارە بکاتەوە. ئەو دنیای

بزنسی پێ باشتر بوو، کە ئەدرینالینەکە تێیدا پلەی بەرزتر بوو. سەفەری ئەملاولای کرد، چوو بۆ سەردانی براکانی و خوشکەکانی و ئەو هاورێیانەی بە هەموو لایەکی زەویدا پەرەوازە بووبوون. ماوەیەک لە نەرویج ژیا، بەس حەزی لەوێش نەبوو، لەگەڵ ئەو هەموو ئایەتوڵا چاوشینەی لەوێ بوون و ئەوەش کە دایم سەرمای بوو لەوێ... کاتێکیش ماندوو بوو لە سەفەری زۆر و دووورودرێژ، لە لەندەن جێگیر بوو، کاری وەرگێڕانی پەیڕەونامە تەکنیکییەکانی دەکرد. خوشکەزاکانی زۆر خۆش دەویست.

- بەس بێجگە لە کار؟
- ئاهـ ئەوە... ئەوە بە نهێنی مایەوە. خوا دەیزانێت هەوڵم دا لێی دەرکێشم... خۆی گیر کرد، سڵی کردەوە، خۆی لە پرسیارەکانم پەراندەوە. "هیچ نەبێت ئەوەم بۆ بهێڵەرەوە،" ئەو گوتی. "بهێڵە کەرامەتی خۆم بپارێزم. کەرامەتی ئەوانەی نهێنی دەپارێزن. ئەوە زۆرە داوای بکەم؟" یانیش ئەوەتا دەردی دەدامێ و ئەشکەنجەی دەدام، لەو کاتەدا پێدەکەنی. "ڕاستی، پێم نەگوتی من شووم کرد مانگی پێشوو؟ چەند کەرم، ویستم وێنەکانت پیشان

بدەم بەڵام بیرم چوو بیانهێنم. پیاوەکە ناوی **بیلی**یە؛ زۆر سەرلێدەرچوو نییە، بەس زۆر باش نازی من دەکێشێت...

تۆ پێکەنینت دەهات بەوە؟

نا، نەوەڵا.

ئەوت خۆش دەویست؟

بەڵێ.

چۆن ئەوت خۆش دەویست؟

خۆشم دەویست.

ئەی چیت لەو ساڵانە بیر دەکەوێتەوە؟

ژیانێک بە وێنەی هێڵێکی نوختەنوختە... هیچ، ئینجا شتێک. ئینجا دیسان هیچ. ئینجا شتێک. ئینجا دیسان هیچ... زۆر خێرا تێپەڕی... کە بیری لێ دەکەمەوە، وای دەبینم هەموو شتەکە وەرزێکی خایاندبێت... تەنانەت وەرزێکیش نا، بە درێژاییی یەک هەناسە بوو. جۆرێک بوو لە سەراب... ئێمە هیچ ژیانی ڕۆژانەمان پێکەوە نەبوو. ئەوە بوو لە هەموو شتێک زیاتر **مەتیلدا**ی ئازار دەدا، وا بزانم... من گومانم لەوە کردبوو، بۆ زانینت، بەڵام بەڵگەکە ئێوارەیەکیان دوای ڕۆژێکی درێژی کار دەرکەوت.

که چوومە ژوورەوە، ئەو لەسەر مێزێکی نووسینی بچکۆلە دانیشتبوو، لەسەر کاخەزی هوتێلەکە شتی دەنووسی. بەو دەستوخەتە بچووک و وردەی خۆی بە دەرزەن لاپەڕەی پڕ کردبووەوە.

"ئەوە بۆ کێ دەنووسیت ئاوا؟" من خۆم بە لای ملیدا نووشتاندەوە و پرسیم.

"بۆ تۆ."

"من؟"

بەجێم دەهێڵێت، بە خۆمم گوت و یەکسەر هەستم کرد نەخۆشم.

"چییە ئەوە؟ بە تەواوی ڕەنگت پەڕیوە. حاڵت باشە؟"

"بۆچی بۆ من دەنووسی؟"

"ئۆهـ من خۆ نامەت بۆ نانووسم، هەر ئەو شتانە دەنووسمەوە کە دەمەوێت لەگەڵ تۆدا بیانکەم..."

ئەو ناوە هەمووی پەڕە بوو. لە چواردەوری، لەبەر پێیدا، لەسەر سیسەمەکە. من یەکێکم هەڵگرت کە هەروا هات بە دەستمەوە:

بچم بۆ سەیران، لە کەناری ڕووباردا سەرخەوێک بشکێنم، قۆخ بخۆم، ڕۆبیان،

کوراسون، برنجی بڵ، مەلە بکەم، سەما بکەم، پێڵاو بۆ خۆم بکڕم، جلی خەو، عەتر، ڕۆژنامە بخوێنمەوە، سەیری جامخانەی دوکانەکان بکەم، سواری مێترۆ ببم، لە تێپەڕینی کات بڕوانم، پاڵت پێوە بنێم کە هەموو جێگەکە دەگرێت، جل هەڵخەم، بچم بۆ ئۆپێرا، بۆ بایرۆیت، بۆ ڤیەننا، بۆ پێشبڕکێکان، بۆ سوپەرمارکێت، گۆشت ببرژێنم، ببۆڵێنم کە تۆ خەڵووزەکەت بیر چووە، ددانم بشۆم لە هەمان ئەو کاتەدا کە تۆ ددانت دەشۆیت، جلی ژێرەوەت بۆ بکڕم، چیمەن ببڕم، لەسەر شانتەوە ڕۆژنامە بخوێنمەوە، نەهێڵم بادەم زۆر بخۆیت، سەردانی ڕەزەکانی لوا بکەم، ئەوانەی هەنتەر ڤالییش، وەک بێعەقڵێک ڕەفتار بکەم، چەنە بدەم، بە مارتا و تینۆت بناسێنم، تووتڕک بڕنم، چێشت لێ نێم، بچمەوە بۆ ڤێتنام، ساری لەبەرکەم، باخەوانی بکەم، لە خەوت هەڵسێنم چونکە دیسان دەپرخێنیت، بچم بۆ باخچەی ئاژەڵان، بۆ بازاڕی کۆنە، بۆ پاریس، بۆ لەندەن، بۆ مێلرۆس، بۆ پیکادیلی، گۆرانیت بۆ بڵێم، واز لە جگەرە بێنم، داوات لێ بکەم نینۆکم بۆ ببڕیت، قاپ بکڕم، شتی کەرانە بکڕم، ئەو شتانەی بە کەڵکی هیچ نایەن،

ئایسکریم بخۆم، تەماشای خەڵک بکەم، شەترەنجت لێ بەرمەوە، گوێ لە جاز بگرم، لە ڕێگی، سەمای مامبو و چا-چا بکەم، بێزار بم، ورک بگرم، لچ هەڵکەم، پێبکەنم، وەک ئەڵقە بتکەمە پەنجە بچکۆلەکەم، لەناو مانگاکاندا بۆ خانوو بگەڕێم، عەرەبانە زلەکانی شتکڕین پڕ کەم، بنەبان بۆیاخ کەمەوە، پەردە بدرووم، بە سەعات لەسەر مێزێک دانیشم لەگەڵ خەڵکی سەرنجڕاکێشدا قسە بکەم، بە سەکسووکەکەت بتگرم، قژت بۆ ببڕم، گژوگیا هەڵکەنم، ئۆتۆمبیلەکە بشۆم، دەریا ببینم، سەیری فیلمە هەرزانە کۆنەکان بکەم، دووبارە تەلەفۆنت بۆ بکەمەوە، وشەی پیست پێ بڵێم، فێری چنین ببم، ملپێچێکت بۆ بچنم، هەڵیوەشێنمەوە ئەو ملپێچە ناشرینە، پشیلە کۆکەمەوە، سەگ، تووتی، فیل، پاسکیل بە کرێ بینم، سواریان نەبم، لە جۆلانەیەکی هەڵخراودا بمێنمەوە، دووبارە بەسەرهاتەکانی *وینی وینکڵ*ی نەنکم بخوێنمەوە، دووبارە سەیری عەزییەکانی وینی بکەمەوە، لە سێبەردا مارگریتا بخۆمەوە، مەکر بکەم، فێری بەکارهێنانی ئوتوو ببم، ئوتووەکە لە پەنجەرەکەوە هەڵدەم، لە باراندا گۆرانی بڵێم، لە گەشتیاران هەڵێم، سەرخۆش بم،

هەموو شتێکت بۆ بگێڕمەوە، بیرم بکەوێتەوە کە هەندێک شت وا باشترە نەگوترێن، گوێت لێ بگرم، دەستمت بدەمێ، بڕۆم ئوتووەکە بدۆزمەوە، گوێ لە وشەی گۆرانییەکان ڕاگرم، سەعات میقات کەم، جانتاکانمانم بیر بچێت، چیتر بە پەلە نەچم بۆ هیچ شوێنێک، خۆڵ بڕژم، لێت بپرسم ئایا ئێستاش خۆشت دەوێم، لەگەڵ دراوسێکان قسە بکەم، منداڵیی خۆمت لە بەحرەین بۆ باس بکەم، ئەنگوستیلەکانی نەنکم، بۆنی خەنە و تۆپە عەنبەر، نان بۆ هێلکەوڕۆن ببرژێنم، لەسەر شووشەمرەباکان ناوەکان بنووسم...

چەندین لاپەڕە بەو شێوەیە بەردەوام دەبوو. پەڕە لە دوای پەڕە... من هەر ئەوانەت پێ دەڵێم کە دێنە خەیاڵم، ئەوانەی دێنەوە بیرم. بە عەقڵدا نەدەچوو.

"لە کەیەوە خەریکی نووسینی ئەوەیت؟"

"لەوەتەی تۆ ڕۆشتووی."

"بەس بۆ؟"

"چونکە بێتاقەتم." بە ڕوویەکی خۆشەوە وەڵامی دایەوە. "من لە بێتاقەتیدا دەمرم، ئەگەر تۆ بتوانیت بڕوا بەوە بکەیت!"

هەموو پەڕەکانم هەڵگرتەوە و لەسەر لێواری سیسەمەکە دانیشتم بۆ ئەوەی باشتر ببینم. من بزەم دەکرد، بەس ڕاستت پێ بڵێم، ئیفلیج بووبووم بەو هەموو حەزوئارەزووە، ئەو هەموو وزەیە. بەڵام بزەم کرد بەهەرحاڵێک بوو. ئەو شێوازێکی هەبوو شتەکان بە جۆرێک لێ بکات، کە زۆر خۆش و زۆر زەریف بێت، ئینجا لە کاردانەوەی منیشی دەڕوانی. لەسەر پەڕەیەک، لە نێوان "دەستپێکردن لە بناغەوە" و "لکاندنی وێنەکان بە ئەلبوومدا" نوسیبووی "منداڵێک". هەر ئاوا بێ هیچ کۆمێنتێک. کاتێک ئەو ڕوومەتی خۆی دەگەزی، من بەردەوام بووم لە گەڕان بەو لیستە گەورەیەدا بێ ئەوەی پێڵوویەک بترووکێنم.

"ئێ؟" ئەو چیتر هەناسەی نەدەدا. "پێت چۆنە؟"

"مارتا و تینۆ کێن؟" لێم پرسی.

بە شێوەی دەمیدا، بە شێوازی داکەوتنی شانەکانی و بەربوونەوەی دەستەکانیدا، زانیم کە ئیتر ئەو لە دەست دەدەم. هەر بەو پرسیارە کەرانەیەی کردم، سەری خۆم دا بە فەتارەتدا. ئەو چووە حەمامەکە و گوتی، "خەڵکێکی باشن،" بەر لەوەی دەرگاکە دابخات.

ئینجا لە جیاتی ئەوەی بچم بۆ لای، لە جیاتی ئەوەی خۆم بخەم بەسەر پێیدا بڵێم بەڵێ، هەرچییەک ئەو بیەوێت، چونکە بەڵێ، من بۆ ئەوەی ئەو بەختەوەر بکەم هاتوومەتە سەر ئەم زەوییە، چوومە بالکۆنەکە جگەرەیەک بکێشم.

- ئەی دوایی؟

- دوایی هیچ. تامی جگەرەکە جەرگبڕ بوو. چووینە خوارەوە بۆ شێو. جوان بوو **مەتیلدا**. لە پێش چاوی من، لە هەموو کاتێک جوانتر بوو. پڕژیان و چالاک. هەرچیی خەڵکە تەماشایان دەکرد. ژنەکان ئاوڕیان دەدایەوە و پیاوەکان بزەیان بۆ من دەکرد. ئەو... چۆنی بڵێم... دەدرەوشایەوە... پێستی، دەموچاوی، بزەکەی، قژی، سیمای، هەموو شتێک لەودا ڕۆشناییان دەگرتە خۆیان و بە نەرمی پەرچیان دەدایەوە. تێکەڵەیەک بوو لە ژیان و ناسکی، کە هەرگیز دەستی لە سەرسامکردنی من هەڵنەدەگرت. "تۆ جوانی،" من پێم گوت. شانی هەڵتەکاند. "لە چاوی تۆدا." "بەڵێ،" هاوڕا بووم، "لە چاوی مندا..."

ئەمڕۆ کە بیری لێ دەکەمەوە، دوای ئەو هەموو ساڵە، ئەوە یەکەمین وێنەیە کە دێتە

خەیاڵم- ملە بەرزەکەی، چاوە تۆخەکانی و عەزییە بچکۆلە قاوەییەکەی لەو ڕیستۆرانە نەمسایییەدا، شانی هەڵدەتەکێنێت.
دواجار، ئەوە بە مەبەست بوو، ئەو هەموو جوانی و زیندوویەتییە. ئەو باش دەیزانی ئەو ئێوارەیە چی دەکات: ئەو وای لە خۆی دەکرد لە بیر نەچێتەوە. دەشێت من هەڵە بم، بەڵام پێم وا نییە، ئەوە دوانمایشی ئەو بوو، ماڵاوایی ئەو، دەسرە سپییەکەی کە لەبەر پەنجەرەدا ڕایدەوەشاند. ئەو زۆر سەرلێدەرچوو بوو، هەر دەبێت زانیبێتی... تەنانەت پێستی نەرمتر بووبووە. ئەو ئەوەی دەزانی؟ ئەو میهرەبانی دەنواند یان بە سادەیی دڕندایەتی؟ هەردووکیان، وا بزانم... ئەوە هەردووکی بوو...
ئینجا ئەو شەوە، دوای نەوازش و ئاخهەڵکێشانەکان، گوتی:
"دەتوانم پرسیارێکت لێ بکەم؟"
"بەڵێ."
"وەڵامم دەدەیتەوە؟"
"بەڵێ."
چاوم کردەوە.

"تۆ پێت وا نییە من و تۆ باش پێکەوە دەگونجێین؟"
نائومێد بووم؛ من چاوەڕێی پرسیارێکم دەکرد زیاتر... ئم... تووڕەم بکات.
"بەڵێ."
"تۆش پێت وایە؟"
"بەڵێ."
"پێم وایە ئێمە باش پێکەوە دەگونجێین... حەزم لەوەیە لەگەڵ تۆدا بم، چونکە قەت بێتاقەت نابم. تەنانەت ئەو کاتەش کە قسە ناکەین، تەنانەت ئەو کاتەش کە دەست لە یەک نادەین، تەنانەت ئەو کاتەش کە هەر یەکە و لە شوێنێکین، بێتاقەت نابم. قەت بێتاقەت نابم. وا بزانم لەبەر ئەوەیە من متمانەم بە تۆیە، بە بیرکردنەوەکانت. تێدەگەیت؟ من هەموو ئەو شتانەم خۆش دەوێن، کە لە تۆدا دەیانبینم، هەموو ئەو شتانەش کە نایانبینم. عەیبەکانت دەزانم، بەڵام وەکوو دیارە، وا هەست دەکەم عەیبەکانت لەگەڵ چۆنایەتی مندا باش دەگونجێن. من و تۆ لە هەمان شتەکان ناترسین. تەنانەت شەیتانە ناوەکییەکانیشمان باش پێکەوە دەگونجێن! تۆ، تۆ زیاتر لەوە دەهێنیت کە نیشانی دەدەیت، منیش ڕێک بە

پێچەوانەوەم. من پێویستم بە ڕوانینی تۆیە، بۆ ئەوەی تۆزێک... تۆزێک ناوەڕۆکم زیاتر بێت؟
ئەو وشەیە چییە؟" بە فرەنسییەکە بۆی نەهات.
"ئاڵۆزی؟ کە بتەوێت بڵێیت، کەسێک ناخی سەرنجڕاکێشە؟"
"قووڵایی؟"
"ئەوەیە! من وەک کۆلارە وام؛ ئەگەر کەسێک بە پەتێک نەمگرێت، هەڵدەفڕم... تۆش، سەیرە... زۆرجار بە خۆم دەڵێم، کە تۆ بابیی ئەوەندە بەهێزیت بمگریت و بابیی ئەوەندەش زیرەکیت بەرمدەیت..."
"بۆچی ئەم قسانەم بۆ دەکەیت؟"
"چونکە دەمەوێت بزانیت."
"بۆچی ئێستا؟"
"نازانم... دەشێت لەبەر ئەوە بێت، کە بە عەقڵدا ناچێت کەسێک بناسیت و بڵێیت: لەگەڵ ئەم کەسەدا، من بەختەوەرم."
"بەس بۆچی تۆ ئێستا ئەمە بە من دەڵێیت؟"
"چونکە هەندێ جار وا هەست دەکەم، کە تۆ تێناگەیت ئێمە چەند بەختمان هەیە..."
"**مەتیلدا؟**"
"بەڵێ؟"
"بە نیازیت بەجێم بهێڵیت؟"

"نەء."
"تۆ دڵت خۆش نییە؟"
"زۆر نا."
ئیتر لەوێدا لە قسەکردن وەستاین.

ڕۆژی دوایی لارەلار چووین بۆ چیاکان و ڕۆژی دواتر، هەر یەکەمان ڕۆشت بە ڕێی خۆیەوە.

چایەکەم خەریکبوو سارد دەبووەوە.

- ئەوە کۆتاییەکەی بوو؟
- بە نزیکی.

چەند حەفتەیەک دوای ئەوە، ئەو هات بۆ پاریس و پرسی ئەگەر چەند خولەکێک کاتم هەبێت بۆی. من هەم دڵخۆش و هەم بێزاریش بووم. ماوەیەکی زۆر پیاسەمان کرد، بە ئەستەم قسەمان کرد، ئینجا بردم بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ لە شانزلیزێ.

لە کاتێکدا من ئازایەتیم دەدایە بەر خۆم کە دەستی بگرم، ئەو وڕی کردم بەوەی گوتی:

"پێی، من سکم هەیە."

" لە کێ؟" من وەڵامم دایەوە، ڕەنگم پەڕی.

ئەو بە شەوقەوە هەستایە پێ.

"کەس."

پاڵتۆکەی لەبەر کرد و کورسییەکەی پاڵ نایەوە شوێنی خۆی. بزەیەکی شکۆدار لەسەر دەموچاوی بوو.

"سوپاس، تۆ ئەو وشانەت گوت، کە من پێشبینیم دەکردن. من ئەو هەموو ڕێیە لەبەر ئەوە هاتووم گوێم لێت بێ ئەو دوو وشەیە بڵێیت. کەمێک سەرکێشی بوو بۆ من."

من زمانم گیرا؛ ویستم هەستمە پێ، بەس قاچی مێزەکە... ئەو ئاماژەیەکی کرد:

"مەجووڵێ."

چاوەکانی بریسکانەوە.

"من ئەوەم دەست کەوت کە دەمویست. نەمدەتوانی خۆم ڕازی بکەم بەوەی وازت لێ بهێنم. ناتوانم ژیانم بە چاوەڕوانیی تۆ بەرمە سەر، بەس من... هیچ. پێویستم بەوە بوو گوێم لەو دوو وشەیە بێت. پێویستم بەوە بوو نامەردییەکەت ببینم. بەوەی لە نزیکەوە

ئەزموونی بکەم، تێدەگەیت؟ نا، مەجووڵێ...
مەجووڵێ، پێت دەڵێم! مەجووڵێ! من دەبێ
بڕۆم ئێستا. زۆر ماندووم... خۆزگە بەس
بتزانیایە چەند ماندوو بووم، پیێ... من... من
چیتر ناتوانم ئەمە بکەم..."
هەستامە پێ.
"تۆ ڕێم دەدەیت بڕۆم، وایە؟ تۆ ڕێم دەدەیت؟
دەبێت ڕێم بدەیت بڕۆم ئێستا، دەبێت ڕێم
بدەیت..." دەنگی گیرا. "تۆ ڕێم دەدەیت بڕۆم، وا
نییە؟"
سەرم لەقاند.
"بەس تۆ دەزانیت خۆشم دەوێیت، ئەوە
دەزانیت، مەگەر نا؟"
دواجار ئەوەم پێ گوترا.
ئەو ڕۆشت و بەر لەوەی دەرگاکە بکاتەوە
ئاوڕی دایەوە. بە تیژی تەماشای کردم و
سەری لە چەپەوە بۆ ڕاست ڕاوەشاند.

خەزوورم هەستا مێروویەک بەسەر گڵۆپەکەوە بکوژێت.

ئەوەی لە بوتڵەکەدا مابوو، لە گڵاسەکەیدا خاڵی کردەوە.

- ئیتر ئەوە کۆتایی بوو؟
- بەڵێ.
- تۆ نەڕۆشتی بە شوێنیدا؟
- وەکوو فیلمەکان؟
- بەڵێ. وەکوو فیلمە خاوەکان...
- نەء. چووم نوستم.
- چووی نوستی؟
- بەڵێ.
- جا لە کوێ؟
- لەماڵەوە، هەڵبەت!
- بۆ؟
- لاوازییەکی زۆر، ماندوویێتییەکی زۆر، زۆر... بۆ چەند مانگێک، خووم بە وێنەی دارێکی مردووەوە گرتبوو. هەموو کاتی ڕۆژ و شەو، خەیاڵم دەکردەوە بە دارێکی مردوودا سەر دەکەوم و لە خۆم دەگەڕام بەناو قەدە

کلۆرەکەیدا بخزێمە خوارەوە. کەوتنەکە هێندە نەرم بوو، هێندە نەرم بوو... وەک ئەوەی لەسەر پەڕەشووتێک هەڵبەزیمەوە. هەڵدەبەزیمەوە و دادەبەزیمەوە، قووڵتر دەکەوتم و دووبارە هەڵدەبەزیمەوە و دادەبەزیمەوە. بە بەردەوامی بیرم لەوە دەکردەوە. لە کۆبوونەوەکاندا، لەسەر نانخواردنی ئێواران، لە ئۆتۆمبیلەکەمدا، لە کاتێکدا کە دەمویست بنووم. بەسەر دارەکەمدا سەردەکەوتم و لە خۆم دەگەڕام بکەوم.

- ئەوە خەمۆکی بوو؟
- وشەی وا گەورە بە کار مەهێنە، تکایە، وشەی گەورە نا... تۆ دەزانی لای خێزانی دیپلەکان چۆنە.

لەبەر خۆیەوە پێکەنی.

- تۆ قەیرێک لەمەوپێش گوتت. نە دڵتەنگی، نە ڕق، نە پەستی. نا، من نەمدەتوانی ڕێ بە خۆم بدەم بکەومە سەر ئەو جۆرە هەوەسانە. بۆیە هاتمە سەر نەخۆشیی جگەر. ئەوە ماقووڵتر بوو. ڕۆژی دوایی لە خەو هەڵسام و سپێنەی چاوم وەک لیمۆ زەرد بووبوو. هەموو شت

تامی ناخۆش بوو، میزەکەم تۆخ، کارم تەواو بوو. حاڵەتێکی پیسی نەخۆشیی جگەر، بۆ کەسێک کە سەفەری باشی کردووە، شتێکی ئاشکرا و ڕوون بوو.

ئەو ڕۆژە **کریستین** جلەکانی لەبەر داکەندم. نەمدەتوانی بجوڵێم... یەک مانگ بە هێڵنج و شەکەتییەوە لە جێدا مامەوە. کە تینووم دەبوو، چاوەڕێم دەکرد تا کەسێک دەهاتە ژوورەوە و گڵاسێکی بۆ ڕاهێشت دەکردم، کە سەرماشم دەبوو، هێزی ئەوەم نەبوو لێفەکە هەڵکێشمە سەر خۆم. چیتر قسەم نەکرد. قەدەغەم کرد کەس پەنجەرەکان بکاتەوە. بووم بە پیاوێکی پیر. هەموو شتێک شەکەتی دەکردم: میهرەبانیی **سوزان**، بێهێزییەکەم، چرپەی منداڵەکان. زەحمەت نەبێت یەکێک هەیە یەکجار و بۆ هەمیشە ئەو دەرگایە داخات و بە تەنیا لەگەڵ ئازارەکانم جێم بێڵێت؟ داخۆ **مەتیلدا** دەهات ئەگەر... داخۆ ئەو... ئۆهـ... زۆر ماندوو بووم. هەموو بیرەوەری و پەشیمانی و ترسنۆکییەکانیشم زیاتر و زیاتر بە زەوییاندا دەدام. بە چاوی نیوەداخراو و گەدەی تێکەڵهاتووەوە، بیرم لە ژیانم دەکردەوە کە چ کارەساتێکە. بەختەوەری هیی من بوو و من

لێی گەڕام بخزێت لە دەستم، هەر بۆ ئەوەی ژیانی خۆم ئاڵۆز نەکەم. کەچی هێشتا هێندەش سانا بوو. من هەر ئەوەندەم لەسەر بوو دەستێک بەرم. باقییەکەی بە شێوازێک یان یەکی تر هەر سەرخۆ دەکەوتەوە. کاتێک تۆ بەختەوەریت، هەموو شتێک جێی خۆی دەگرێت، پێت وا نییە؟

- نازانم.
- بەس من دەزانم. بڕوام پێ بکە. من زۆر نازانم، بەس ئەمە دەزانم. لە کەسی تر ڕۆحانیتر نیم، بەس دووتەمەنی تۆم هەیە. دووتەمەنی تۆ، ئەوە دەزانیت؟ ژیان لە تۆ بەهێزترە، تەنانەت کە نکۆڵیشی لێ دەکەیت، تەنانەت کە پشتگوێشی دەخەیت، تەنانەت کە ڕەتیشی دەکەیتەوە ددانی پێدا بنێیت. لە هەموو شتێک بەهێزترە. خەڵک لە ئۆردووگەکان گەڕانەوە و منداڵیان دروست کرد. پیاو و ژنگەلێک، کە ئەشکەنجە درابوون، کە خۆشەویستەکانیان بەبەر چاویانەوە مردبوون و ماڵەکانیان کرابوون بە خۆڵەمێش. گەڕانەوە و بە شوێن پاسدا ڕایان دەکرد، باسی کەشوهەوایان دەکرد و کچەکانیان دەدا بە شوو. ئەوە بە عەقڵدا ناچێت، بەڵام ئاوایە ئیتر.

ژیان لە هەموو شتێک بەهێزترە. جا ئێمە کێین هێندە خۆمان پێ گرنگ بێت؟ هەراوهوریا دەنێینەوە، بە دەنگی بەرز قسە دەکەین، ئاخر لەبەر چی؟ ئینجا دوایی چی دەبێت؟
**سیلڤی**یە بچکۆلەکە چی بەسەر هات، کە **پۆل** لە ژوورەکەی ئەودیودا بۆی مرد؟ چی لێ هات؟
ئاگرەکە خەریکە دەکوژێتەوە.

هەستا لقەدارێکی تری بنێتە سەر.



- *ئینجا* من؟ گوتم، من لە کوێی ئەم هەموو شتەدا جێم دەبێتەوە؟ من لە کوێدام؟

لە بەردەم ئاگردانەکەدا چیچکەی کرد.

- تۆ بڕوا بە من دەکەیت، **کلۆوی**؟ بڕوام پێ دەکەیت کە دەڵێم ژیان لە تۆ بەهێزترە؟
- بە دڵنیاییەوە...
- تۆ متمانە بە من دەکەیت؟
- ئەوە دەکەوێتە سەر ڕۆژ.

- ئەی ئەمڕۆ چی؟
- بەڵێ.
- کەواتە پێم وایە، کە دەبێت ئێستا بچی بنوویت.
- تۆ قەت ئەوت نەبینییەوە؟ قەت هەوڵت نەدا بزانیت ئەحواڵی چۆنە؟ قەت تەلەفۆنت بۆ نەکرد؟

هەناسەی هەڵکێشا.

- تۆ بەست نییە؟
- نەء.
- تەلەفۆنم بۆ خوشکەکەی کرد، هەڵبەت، تەنانەت خۆشم چووم بۆ ئەوێ، بەس بە کەڵکی هیچ نەهات. ئەو بۆی دەرچووبوو... بۆ ئەوەی بمدۆزیایەتەوە، دەبوو بزانم لە کام **هامشێ**وە دەست بە گەڕان بکەم... ئینجاش، من بەڵێنم دابوویە لێی گەڕێم. ئەوە یەکێکە لە کواڵێتییە دیارەکانی من، بەو بۆنەیەوە.
من کە دەدۆڕێم باش دەدۆڕێم.
- ئەوەی تۆ دەیڵێیت تەواو بێمانایە. ئەوە حەقی بە باشدۆڕان و خراپدۆڕانەوە نییە. ئەوە بیانووهێنانەوەیەکی تەواو کەرانەیە، کەرانە و منداڵانەش. ئەوە یاری نەبوو، پاشی هەموو

شتێک... یان یاری بوو؟ ئەوە هەمووی یارییەک بوو؟

خۆشحاڵ بووبوو.

- بەڕاستی، پێویست ناکات من نیگەرانی تۆ بم، کچی خۆم. تۆ ئەسڵەن نازانیت من چەند ڕێزی تۆم لایە. تۆ هەموو ئەو شتانەت تێدایە، کە لە مندا نییە، تۆ ئەستێرەی منی و عاقڵیی تۆ هەموومان ڕزگار دەکات...
- تۆ سەرخۆشی، وایە؟
- دەتەوێت شتێک بزانیت؟ قەت لە ژیانمدا هێندە هەستم بە باشی نەکردووە!

بە دەستگرتن بە ڕەفەکەوە خۆی هەستانە پێ.

- با بچین بخەوین.
- تۆ تەواوت نەکرد...
- دەتەوێ نەختێکی تریش گوێت لە گرمەگرمم بێت؟
- بەڵێ.
- بۆ؟
- چونکە حەزم لە چیرۆکی باشە.

- تۆ پێت وایە، کە ئەمە چیرۆکێکی باشە؟
- بەڵێ.
- منیش...

- تۆ دواتر ئەوت بینییەوە، وایە؟ لە پالەی- ڕۆیاڵ؟
- تۆ ئەوەت چۆن زانی؟
- تۆ خۆت پێت گوتم!
- ئۆهـ بەڕاست؟ من ئەوەم گوت؟

سەرم لەقاند.

- ئێ، باشە، ئەمە دواهەمین پەردەیە...
ئەو ڕۆژەیان، کۆمەڵێک کڕیارم داوەتی گراند ڤیفور کردبوو. **فرانسواز** هەموو شتێکی ڕێک خستبوو. شەرابی چاک، بە دەوروخولدا هاتن، قاپی نایاب. من تا ئەوسەری ڕۆشتبووم. دەتگوت، لەوەتەی دنیا دنیایە من هەر ئەوە کارم بووە... نانی نیوەڕۆ تەواو مایەی وەڕزی بوو. من دایم ڕقم لە شتی وا بووە، چەندین سەعات لەگەڵ ئەو پیاوانەدا بەسەر بەرم، کە پێم هیچ نین، ئەوان سەبارەت بە کارەکانیان چەنە دەدەن و تۆ ناچاریت گوێیان لێ بگریت...

سەرڕای ئەوەش من بووم خۆشیی گرووپەکەم تێک دابوو بە هۆی جگەرمەوە. قەیرێکی باش، یەک تکە کحولم نەخواردەوە و لە گارسۆنەکانم داوا دەکرد پێم بڵێن کوللی خواردنێک لەوانە ڕێک چی و چی تێدایە. دەزانیت مەبەستم لە کام جۆرە بەلایانەیە... ئەوەشی بێتە سەر، من زۆر تاقەتی هاوەڵیکردنی پیاوم نییە. وەڕزم دەکەن. لە قوتابخانە چۆن بوون دواییش هەر وان. فشەکەرەکان هەر وەک خۆیانن و ماستاوکەرەکانیش هەروا...

جا، من لەوێدا بووم لەو خاڵەی ژیانمدا، لە بەردەم دەرگای ڕیستۆرانێکی پلەیەکدا، کەمێک سست، تۆزێک ماندوو، سیگارێکی گەورەم دەتەکاند، دڵغەم لای ئەو ساتە بوو کە بتوانم قایشەکەم شل بکەمەوە، کاتێک ئەوم بەدی کرد. ئەو بە خێرایی دەڕۆیشت، تا ڕادەیەک ڕای دەکرد، کوڕێکی بچکۆلە و خەمگینیشی بە دوای خۆیدا ڕادەکێشا. "**مەتیلدا؟**" لەژێر لێوەوە گوتم. بینیم ڕەنگی پەڕی، خەریک بوو بکەوێت. هێواشی نەکردەوە. "**مەتیلدا!**" بە دەنگێکی بەرزتر گوتم. "**مەتیلدا!**" و ئینجا وەک شێت ڕام

کرد به دوایدا. "**مەتیلدا!**" تا ڕادەیەک هاوارم کرد. کوڕە بچکۆلەکە ئاوڕی دایەوە.
داوەتی قاوەیەکم کرد لە قەیسەرییەکەدا. هێزی ئەوەی نەبوو ڕەتی بکاتەوە؛ ئەو... ئەو هێشتا هەر جوانییە زۆرەکەی مابوو. من هەوڵم دا سرووشتی ڕەفتار بکەم. تۆزێک نائاسایی بووم، تۆزێک کەر، تۆزێک زۆر بزێو. ئەوە سەخت بوو.
ئەو لە کوێ دەژیا؟ چی دەکرد لێرە؟ دەمویست باسی خۆیم بۆ بکات. پێم بڵێ چۆنیت. لێرە دەژیت؟ لە پاریس دەژیت؟ ئەو بە نابەدڵی وەڵامی دایەوە. ناڕەحەت بوو و کلکی کەوچکی قاوەکەی دەکرۆشت. من سەیری ئەو کوڕە بچکۆلە قژزەردەم دەکرد، کە سەموونی بەرماوەی سەر مێزەکانی دەوروبەری کۆ دەکردەوە و پەنچکەسەمموونی بۆ باڵندەکان هەڵدەدا. دوو تۆپەڵی دانابوو، یەکیان بۆ چۆلەکەکان و یەکیان بۆ کۆترەکان، ئینجا سەرقاڵی ڕێکخستنی ئەو دنیا بچکۆلەیە بوو. نەدەبوو کۆترەکان لە وردەسەمموونی باڵندە بچکۆلەکان بەرن. "*بڕۆ ئەولاوە، تۆ!*" بە ئینگلیزی هاواری دەکرد، شەقێکی دەهاویشت. "بڕۆ ئەولاوە، تۆ باڵندەی کەر!" کاتێک ئاوڕم

دایەوە بە لای دایکیدا، خەریک بوو قسە بکەم،
ئەو لە کورتی پێی بڕاندمەوە:
"ئەزێت مەکێشە، پیی، ئەزێت مەکێشە. کوڕەکە
تەمەنی پێنج ساڵ نییە... هێشتا نەبووە بە پێنج،
تێدەگەیت؟"
دەمم داخست.
"ناوی چییە؟"
"تۆم."
"بە ئینگلیزی قسە دەکات؟"
"ئینگلیزی و فرەنسی."
"منداڵی ترت هەیە؟"
"نەخێر."
"ئەی تۆ... ئەی تۆ... یانی... ئەی تۆ لەگەڵ
کەسێکدا دەژیت؟"
ئەو شەکری بنی کوپەکەی دەکڕاند و بزەیەکی
بۆ کردم.
"ئێستا دەبێت بڕۆم. چاوەڕێمان دەکەن."
"وا زوو؟"
هەستایە پێ.
"دەتوانم بتگەیەنمە شوێنێک؟ من..."
جانتاکەی هەڵگرت.
"پیی تکایە..."

ئیتر من هارەم کرد. قەت پێشبینیی ئەوەم نەکردبوو. وەک منداڵ دەستم کردە گریان. من... ئەو منداڵە بۆ من بوو. بۆ من بوو فێری بکەم چۆن کۆتر ڕاو بنێت، بۆ من بوو بلووسەکەی هەڵبگرم و کڵاوەکەی بکەمە سەر. بۆ من بوو وا بکەم. لەوەش زیاتر، دەمزانی ئەو درۆ دەکات! کوڕەکە لە چوارساڵ زیاتر بوو. من کوێر نەبووم دواجار! بۆچی ئەو ئاوا درۆی لەگەڵ دەکردم؟ بۆچی درۆی لەگەڵ کردم؟ کەس مافی ئەوەی نییە ئاوا درۆ بکات! هیچ کەس... دابوومە پرمەی گریان. ویستم بڵێم کە-

ئەو کورسییەکەی خۆی پاڵ نایە دواوە.

"من دەڕۆم ئێستا. چی فرمێسکم هەبوو پێشتر ڕشتوومە."

- ئەی دوای ئەوە؟
- دوای ئەوە من ڕۆیشتم...
- نا، مەبەستم لەگەڵ **مەتیلدا**، چی ڕووی دا؟
- دوای ئەوە، تەواو بوو.
- بەڕاستی تەواو بوو؟
- تەواو بوو.

بێدەنگییەکی درێژ بوو.

- ئەو درۆی دەکرد؟
- نا. لەو کاتەوە من زیاتر ورد دەبوومەوە. ئەو کوڕەم بە منداڵانی تر بەراورد کرد، بە کچەکانی تۆ... نا، پێم وا بێت، کە درۆی نەدەکرد. منداڵی ئەمڕۆژە زۆر زلن... بەو هەموو ڤیتامینەی دەیخەیتە شووشەشیرەکانیانەوە... هەندێ جار بیر لەو کوڕە دەکەمەوە... ئێستا دەبێت نزیکی پازدە ساڵ ببێت... دەبێت زۆر کەتە بێت، ئەو کوڕە.
- تۆ قەت هەوڵت نەدا **مەتیلدا** ببینیتەوە؟
- نەء.
- ئەی ئێستا؟ لەوانەیە ئەو-
- ئێستا تەواو بووە. ئێستا من... من ئەسڵەن نازانم ئەگەر هێشتا بتوانم...

بەربەستی ئاگرەکەی قەد کرد.

- نامەوێت ئیتر باسی بکەم.

چوو دەرگای پێشەوە کلۆم بدا و هەموو گڵۆپەکانی کوژاندنەوە.

من لەسەر قەنەفەکە نەجووڵام.

- دەی، **کلۆوی**... دەبینیت سەعات چەندە؟ ئێستا بچۆ جێگەکەتەوە.

وەلامم نەدایەوە.

- گوێت لێمە؟
- کەواتە خۆشەویستی بەس قسەی قۆڕە؟ وایە؟ قەت سەر ناگرێت؟
- هەڵبەتە سەر دەگرێت. بەس تۆ دەبێت بجەنگێی..
- چۆن بجەنگێی؟
- دەبێت هەموو ڕۆژێک و تۆزێک بجەنگێی. هەر ڕۆژە و تۆزێک، ئازایەتیی ئەوەشت هەبێت کە خۆت بیت، کە بڕیار بدەیت دەبێت بەختەوە-
- ئۆهـ جوانە ئەوە! تۆ ڕێک دەڵێی **پاولۆ کۆیلۆی** قسە دەکەیت...
- بەردەوام بە و پێبکەنە، بەردەوام بە...

- ئەوەی کە خۆت بیت، واتا ژنەکەت و منداڵەکانت جێ بهێڵیت؟
- کێ باسی منداڵجێهێشتنی کردووە؟
- ئۆهـ بەسیکە. تۆ دەزانیت من ڕێک مەبەستم چییە...
- نا، نازانم.

دیسان دەستم بە گریان کردەوە.

- دەی، بڕۆ. با بە تەنیا بم. هیچی تر تاقەتی ئەو هەستە بەرزانەی تۆم نەما. ناتوانم ئیتر. زۆرە بۆ من، مستەر دەروون-ڕووت، ئەوە زۆرە...
- دەڕۆم، دەڕۆم. مادەم هێندە بە جوانی داوام لێ دەکەیت...

لە دەم دەرگای ژوورەکەدا، گوتی:

- یەک چیرۆکی تر و تەواو، بۆم هەیە؟

نەمدەویست گوێم لێی بێت.

- ڕۆژێکیان، ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر، کچە بچکۆلەکەمم برد بۆ سەموونخانە. ئەوە دەگمەن بوو من لەگەڵ کچەکەم بچم بۆ سەموونخانە. دەگمەن بوو ئێمە دەستی یەکتر بگرین و ئەسڵەن زۆر دەگمەنتریش بوو من بە تەنیا لەگەڵ ئەودا بم. دەبێت بەیانیی یەکشەممە بووبێت، جا سەموونخانەکە پڕ بوو لە خەڵک، تارتی میوە و مەرانگیان[٢٥] دەکڕی. کە هاتینە دەرەوە، داوای سەری سەموونەکەی لێ کردم بۆ ئەوەی بیخوات. من نەمدایە. گوتم *نا، کە لەسەر مێزی نانخواردن دانیشتین ئینجا.* ڕۆشتینەوە بۆماڵەوە و دانیشتین نان بخۆین. خێزانێکی بچکۆلەی پێرفێکت. سەموونەکە من بڕیم. خۆم پێداگریم کرد. ویستم بەڵێنەکەم بەرمە سەر. بەڵام کە سەری سەموونەکەم دا بە کچەکەم، ئەو دای بە براکەی.

"بەس تۆ پێت گوتم ئەوەت دەوێ..."

"ئەوسا دەمویست،" ئەو لەگەڵ کردنەوەی دەسڕەکەیدا گوتی.

---

[٢٥] جۆرێکە لە شیرینی.

"بەڵام هەر هەمان تامی هەیە،" من جەختم کردەوە. "هەمان شتە..."
ئەو ڕووی بەولادا کرد.
"نامەوێت سوپاس."

من دەچمە جێگەوە و لە تاریکییەکەدا جێت دەهێڵم، ئەگەر تۆ ئەوەت دەوێت، بەس پێش ئەوەی گڵۆپەکان بکوژێنمەوە، دەمەوێت یەک پرسیار بکەم. لە تۆی ناپرسم، لە خۆمی ناپرسم، من لە دیوارەکانی دەپرسم:
- ئەو کچە بچکۆلە کەللەڕەقە، پێی باشتر نەدەبوو لەگەڵ باوکێکی کەمێک بەختەوەرتردا بژی؟

